# فاكتەرەكانی
# زۆربوونی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی
## ڕۆڵی قانون و ڕێگەكانی چارەسەری

نووسینی
بێدار فارس عەزیز
نیگار دلێر ئەحمد

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

**فاکتەرەکانی زۆربوونی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی**

**و رۆڵی قانون و رێگەکانی چارەسەری**

- **نووسینی: بێدار فارس عەزیز و نیگار دلێر ئەحمد**
- **هەڵەچن و پیتچنین:** بێدار فارس
- **بابەت:** کۆمەڵناسی و قانون
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ: هۆگر سدیق**
- **ژمارەی سپاردن: ٥١٩**
- **نرخ: ١٠٠٠ دینار**
- **چاپی یەکەم**
- **تیراژ: ١٠٠٠ دانە**
- **چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)**

**زنجیرەی کتێب (٣٦٧)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com



هەموو مافەکانی پارێزراوە بۆ نووسەر، هیچ کەسێك بۆی نیە ئەم کتێبە یان بەشێکی، بە هیچ رێگە و شێوازێکی میکانیکی یان ئەلیکترۆنی، چاپ یان کۆپی بکات، تەنها بە رێپێدانی دەستنووسی نووسەر نەبێت.




## پێشکەشە بە ناڵەنی ئەو رۆحانەی پێی گرفتارن

## ناوەڕۆك

## بەناوی خودای گەورە و بەخشندە

**پێشەكی:**

پاش بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی لە كوردستان هێتر بابەتی بەختەوەری لە ژیان كەوتە مەترسییەوە، هەركەس لەلای خۆیەوە سەرسوڕمانی بەرامبەر دەربڕی و نیشانەی پرسیاری خستە سەر فاكتەرەكانی، تاكەكان و دادگا و میدیاكان و سەرتاپای لایەنە پەیوەندیدارەكان گرفتاری خۆیان دەربڕی لەمەڕ ئەم قەیرانە و هەریەك بانگێشتی دانانی چارەسەری دەكرد، ئەوەش ئەوەندە سادە نەبوو بەو شێوەیە بتوانرێ چارەبكرێ.

قەیرانەكە هەڵوەشانەوەی هاوسەریی نەبوو چونكە ئەم بابەتە لە هەموو كۆمەڵگایەك هەبووە و بنبڕ ناكرێ بگرە جاری وەها هەیە چارەسەرە، بەڵكو قەیرانەكە زۆربوونی هەڵوەشانەوە بوو.

لەبەر ئەوەی هیچ توێژینەوەیەكی دەرەوەی كوردستان سوودمەند نەدەبوو چونكە هەر كۆمەڵگایەك لە قالبێكە و جیایە لە قالبی كۆمەڵگایەكی دیكە، بۆیە پێویست وابوو كەسێكی كوردستانی كە لەناو كوردستان بژێ هەڵسێ بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەكی زانستیی قول بۆ دیاركردنی فاكتەرەكان و دەسنیشانكردنی چارەكان و ئامراز و میكانیزمەكانی چارەسەری بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ڕەگ و ڕیشەی بابەتەكە.

زەواج هەر لە كۆنەوە بە دامەزراوەیەكی گرینگ دانراوە و پایەیەكی یەكلاكەرەوە و بەرز نرخی لە پێگەی كۆمەلایەتی هەبووە[1] هەروەها هەلوەشانەوەی خێزانیش (تەلاق،جیابوونەوە) جێگەی سەرنج و ڕێكخستنی مرۆڤ بووە، لە هەندێ شوێن و كات قەدەغەكراوە و لە بەشێكی دیكە ئاسایی بووە و لە هەندێكی دیكە كۆتداریان كردووە.

1- Grada A.Kleijkamp, Family Life and Family Interests, Published by Klawer Law International, First Published, 1999, P1 .



شەریعەی ئیسلامی گرینگیەكی یەكجار زۆری بەم بوارە داوە و هەولێداوە خێزان بەردەوام و تەندروست و پتەو بێت، تەلاقیشی داناوە تەنها بۆ پێویستی[2] هەروەك پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێ ( لا تطلقوا النساء فان الطلاق يهتز منه العرش) [3] .

ئەم كۆتداركردن و ناحەزكردنەی شەریعەی ئیسلامی بێ هۆ نی یە[4] چونكە گەر بكرێتە بابەتێكی سادە ئەوا هەزاران كێشە و تاڵی بەسەر تاك و كۆمەڵگا دێت. هەرچەندە زۆربوونی هەلوەشانەوەی هاوسەریی پشتگوێ بخرێ ئەوا بەردەوام هەزاران كێشە و كاریگەرە خراپەكانی لە زیادبوون دەبێ.

لێرە پێویستە پێناسەیەكی تەلاق بكەین لە ڕووی شەرعەوە كە ڕوویەكی هەڵوەشانەوەی خێزانە: بریتیە لە هەلوەشاندنەوەی گرێی هاوسەریی بە لە فزی تەلاق و ئەوەی لەم ڕووەیە[5] ،یان: هەڵگرتنی كۆتی زەواجی دروستە بە لەفزێكی ئاشكرا یان نائاشكرا یان بە نوسین یان بە هێما [6] .

٢- د.حسن علي الذنون، المبسوط في شرح القانون المدني ، الخطا (المبسوط في المسؤولية المدنية)، ط٢، ج ٢، دار وائل، عمان، ٢٠٠٦، ص ٤٢٨.

٣- لێرە پرسیار دەكرێ كەوابێ شتێكی ئاوها ناحەزە بۆچی دانراوە؟ هەروەكو وتمان تەلاق دانراوە بۆ پێویستی، لە كاتێك دووهاوسەرەكە هەموو ڕێگە چارەیەك دەگرنە بەر بەلام هیچ سودێكی نابێ و ژیانیان گەر وەها بروات دەبێتە دۆزەخ جا لێرە تەلاق دەبێتە بەهێزترین چارەسەر.

انظر: .عبدالله العظيم بدوي، الوجيز في فقة السنة و الكتاب العزيز، ط ٣، دار بن رجب، ٢٠٠١، ص ٣٢١.

٤- انظر: محمد زيد الابياني، شرح الاحكام الشريعية في الاحوال الشخصية، الجزء الاول، منشورات مكتبة النهضة، بيروت-بغداد، ٢٩١-٢٩٢.

٥- د.مصطفى البغاء و د.مصطفى الخن و علي الشرجي، الفقه المنهجي على مذهب الامام الشافعي، ط ٦، المجلد الثاني، احكام الاسرة و ملحقاتها: الاحوال الشخصية: الوقف و الوصية و الفرائض، دار القلم و دار الشامية، ٢٠٠٥، ص ١١٣.

٦- د.احمد علي الخطيب و د.حمد عبيد الكبيسي و د.محمد عباس السامرائي، شرح قانون الاحوال الشخصية، ط ١، دار الكتب للطباعة و النشر، ١٩٨٠،ص ١٢٨.

### ١. کێشەی توێژینەوەکە و ئامانجەکانی:

ئەو کێشەیەی لەم توێژینەوەیە هەوڵمانداوە چارەی بکەین زۆربوونی ڕێژەی تەلاق و جیابوونەوەیە، بە وەڵامدانەوەی پرسیارێك: ئایا هۆ و فاکتەرەکانی زۆربوونی هەلوەشاندنەوەی هاوسەریی چین؟ ئەو ڕێگانە کاوانەن کەپێویستە بگرێنە بەر بۆ چارەکردنی ئەم قەیرانە؟ قانون[٧] چ رۆلێکی دەبێ لەم رووە و چۆن چاکسازی بەرپا دەکات؟

بەم شێوەیە گرینگترین ئامانجەکانی توێژەرمان بۆ ڕووندەبێتەوە، بە کورتی ئەمانەن:

١. فاکتەرەکانی زۆربوونی هەلوەشانەوەی هاوسەریی.
٢. ڕێگەکانی چارەسەری و راوەستان بەرامبەر ئەم کێشەیە.
٣. رۆلی قانون لەڕووبەڕووبونەوە و چاکسازی لەم مەبەستە.
٤. چۆن قانون و بارەکان وەها ڕێکدەخرێ تاکەکان بە زیرەکی و لە کات و شوێنی گونجاو هاوسەریی پێکبهێنن.

٧- وشەی "قانون" وشەیەکی یۆنانی کۆنە، لە " کە نۆنیمۆس"ەوە هاتووە و ئێستا بۆ قانونی "لاهوتی" بەکاردێت. کۆڕی زانیاری کورد وشەی "یاسا"ی پێشنیار کردووە، بەڵام دانی بەوەشداناوە کە ئەم وشەیە تورکی مەغولییە و تێکەڵی زمانی کوردی بووە و ئەسلەکەی " یاسوون"ە. لە زمانی تورکیدا قانون "یاسا"یە. مامۆستا تۆفیق وەهبی دانی بەوەدادەنا کە بۆ یەکەم جار ئەو ئەم وشەیەی لە فەرهەنگەکەیدا بەکارهێناوە و پەشیمانی خۆشی دەردەبڕی لە بەرکارهێنانی و دەیگوت وشەی " قانون" کە لە زمانی یۆنانی کۆنەوە هاتووە لە "یاسا"ی تورکی مەغولی راسترە. چەند زمان زان و قانون زانی کوردی تریش هەر هەمان بۆچوونیان هەیە.
بڕوانە: د. نوری تالەبانی، فەرهەنگی قانونی، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی بیرو هۆشیاری، ٢٠٠٦، سلێمانی، ل ٢٣٥.



٥. چۆن بارودۆخێکی ئەوتۆ دەخوڵقێنرێ پێش پێکهاتن و دوای پێکهێنانی هاوسەری بۆ دروستکردنی زەواجێکی تەندروست و هاندانی هاوسەریی و پتەوکردنی هەروەها ڕێگرتن لە هەر بابەتێك رۆلی هەبێ لە شێواندنی.
٦. دروستکردنی زەواجێکی بەرهەمهێن بە گشت ماناکانیەوە و دروستکردنی ژیانێکی مۆرالی.

### ٢. گرنگی توێژینەوەکە:

بابەتی توێژینەوە بابەتێکی قانونیی و شەرعی و هزری و کۆمەلایەتی تا بلێ ی خاوەن کاریگەریەکی سایکۆلۆجی و فیسیۆلۆجیە، جگە لەو کاریگەریانەی ڕوون و ئاشکران کۆمەڵێ بابەتی نەتەوەیی و ناوخۆیی و نێودەولەتی هەیە ناتوانرێ چارە بکرێ کە هەڵوەشانەوەی هاوسەریی خۆی بە بەرپرس دەزانێ.

زۆربوونی هەلوەشانەوەی هاوسەریی بابەتێکە هەمووان بەرامبەری واقورماون و پرسیار لە لای هەمووان دێت دەربارەی و سەرسورمانی لەئاست دەردەبڕن، کەچی لە لایەکی دیکە قانون لە ڕێکخستنەکانی نەیتوانیوە وەك پێویست پێکهێنانی هاوسەریی ڕێکبخات لەگەڵ کۆتایی هێنانیشی وەك ئەوەی دەبینین بێ هەڵومەرج و لەهەر شوێنێك و هەر چۆنێك و هەر کێیەك دەتوانێ گرێبەستی هاوسەریی پێکبهێنێ و کۆتاییشی پێ بهێنێ و لە ئەنجام دا لە تووڕەبوونی دادوەر زیاتری لێ ناکەوێتەوە.

گرینگی ئەم توێژینەوەیە لە دوو بوار دەبینرێ:

**یەکەمی** لەسەر تاك سەبارەت بە نەخشەی ژیانی تاکەکان و ئەو کاریگەرە سامناکانەی لە بواری بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەلوەشانەوەی هاوسەریی دێتەکایەوە. زیادبوونی ئەم ڕێژەیە بە واتای ژمارەیەکی زیاتر لە تاکەکان توشی مەینەتی و ئازار و ڕەشبینی دەبن و ئەگەری زۆری هەیە توشی جۆرەها نەخۆشی سایکۆلۆجی و فیسیۆلۆجی ببن...جگە لەمە سەرقالبوونی تاکەکان بەم گرفتانە ڕێگر دەبێ لە

بەردەوام بوونی لە ڕێچکەی بەرهەمهێنی و هزری و ڕۆشنبیری... لەوانەشە چەندەها زانای دوارۆژمان لە دەستدابێ و لە دەستی بدەین.

**دووەمی** لەسەر کۆمەڵ، کۆمەڵگای دروست تەنها و تەنها کاتێك دێتەدی ئەگەر یەکەکانی ئەو کۆمەڵگایە دروست و پتەوبێت، جا چی ئەگەر زۆربەی یەکەکانی هەڵوەشابنەوە، مانای ئەو کۆمەڵگایە ڕووە و فەناچوون دەروات، وەك کەسێك لە گەنجیی تەمەنی جەستەی پێگەیشتووە زۆر بەهێزە و چالاکە و بەتوانایە چونکە ڕێژەی ئەو خانانەی دروستدەبێ لە جەستەی یەکجار زیاترە لەو خانانەی دەڕوخێن کەچی کاتێ پیر دەبێ برێکی زۆر لە خانەکانی ڕووە و هەڵوەشانەوە دەچن ئەوا ئیتر بێ هێزە، بۆیە ئەم کەسە پێی دەوترێ پەککەوتە، کۆمەڵگاش هەمان چەشنە. ئەم کێشەیە کاریگەریەکی مەزنی هەیە لە چارەکردنی کێشە و پرسە نەتەوەیی و ناوخۆیی و نێودەولەتیەکانی کورد چونکە نەتەوە و کۆمەڵگایەك لە خێزانی هەڵوەشاوە یان بێهێز و گێژبووی لە ناو گرفت هەبێ بێگومان زاڵ نابێ بەسەر کێشەکانی.

لە ڕووانگەیەکی دیکەوە بابەتی توێژینەوە شوێن پەنجەی لەسەر نەوەکانی داهاتووش دەبێ و ڕۆلێکی بەهێزی هەیە لە لاری منداڵ و توشکردنی بە نەخۆشی دەروونی و جەستەیی، کاریگەریشی لە بەرزکردنەوەی تاوان و بلاوکردنەوەی هەژاری و لەناوبردنی بلیمەتی هەیە.

جا بە چارەکردنی ئەم بابەتە هەموو باسەکانی پێشوو لە قەیرانی نەرێ ڕزگار دەکات.

### ٣. گرانیەکانی توێژینەوەکە:

زیاتر ئەو گرانیانەی ڕووبەڕووی بووینەوە لە کاتی توێژینەوە نەبوونی سەرچاوە بوو لەسەر ئەم بابەتە سەبارەت بە کوردستان چ پەرتووك چ لە توێژینەوە هەروەها نەبوونی دەزگایەکی ئاماری زیرەك هاوکاریمان بکات لە دیاریکردنی تەمەنی ئەو کەسانەی هاوسەریی پێکدەهێنن لەگەل تەمەنی ئەو ساتەی لە خێزان هەلدەوەشێنەوە و کۆمەلێ زانیاری دیکە سەبارەت بە ئاماری زیرەك.



### ٤. پلانی توێژینەوەکە:

هەروەکو باسمانکرد ئەم توێژینەوەیە بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر سێ تەوەرەیە، کە فاکتەرەکانی زۆربوونی هەلوەشانەوەی هاوسەریی و ڕێگە چارەسەریەکان و ڕۆلی قانونە. توێژینەوەکەمان نەکردە سێ بەش و لە هەر بەشێك دەست داگرینە سەر تەوەرەیەك بەلکو لەگەل دیاریکردنی هەر فاکتەرێك هەر لە هەمان بەش باسمان لە ڕێگەکانی چارەسەری و پاشانیش باسمان لە ڕۆلی قانون کردووە، ئەمەش گرینگیەکی تایبەت بە توێژینەوەکە دەدات سەبارەت ڕووبەڕووبوونەوەی هەر یەکە لە فاکتەرەکان و چارەکردنێکی زیاتر تایبەتمەند و تێروتەسەلتر و پتەوتر. فاکتەرەکانیشمان پۆلین کردووە بەپێ ی ڕێگە چارەییەکان بە واتای ئەو فاکتەرانەی هەر هەمان چارەیان هەیە لە یەك بەش پێکەوە باسمانکردووە، بەم شێوەیە دابەشمانکردووە بۆ شەش بەش و بەم چەشنە:

یەکەم: ڕۆلی بچووکی تەمەن کاتی پێکهێنانی هاوسەریی.
دووەم: باری ئابووری.
سێ یەم: ڕۆلی لەکس.
چوارەم: داواکارانی مافی ئافرەت.
پێنجەم: کاریگەری ورووژێنەرە سێکسیەکان.
شەشەم: ڕۆلی ئایین و ڕەوشت و شارەزایی و خۆ هەلقورتان و ئامراز و پێوەرەکانی هەلبژاردن.

داواکارین لە خوێنەری بەڕێز بە خوێندنەوەی چەند دێرێکی کتێبەکە بڕیاری لەسەر نەدات یان دێرێك لە ناوەڕاستی سەلماندنێك جیا نەکرێتەوە و ڕەخنەی لێ بگیردرێ. ڕەنگە توێژینەوەکەمان بێ کەموکوڕی نەبێت بەلام ئاواتەخوازین بەو هەوڵ و کۆششەمان خزمەتێکی ولاتی شیرینمان کوردستان کردبێ.

## ١-١- فاكتەری بچووكیی تەمەن لەكاتی پێكهێنانی هاوسەریی

مرۆڤ تێنووسێكە (دەفتەرێكە) لاپەرەكانی بە تێپەربوونی ڕۆژگار پردەبێتەوە، ئەو زانیاریانەی لەو تێنووسە دەنوسرێ لە چەرخێكەوە بۆ یەكێكی تر جیاوازە و پتەوی زانیاریەكانی بەپێ ی باری ڕۆشنبیری و پێگەی كۆمەڵایەتی و لایەنی ئابووری و هۆكاری دیكە دەگۆرێ. ئەم تێنووسە قالبە بۆ مرۆڤ و بەمە دیدگەی بۆ سەرجەم لایەنەكان دەردەكەوێ، دەكرێ خودی مرۆڤەكە شارەزاییەكی تەواوی لەسەر تێنووسی خۆی نەبێ مەگەر لە ژێری خۆی بێت، ئا لەم نا شارەزایی خودیە هۆكارە وروژێنەرەكان و بیرۆكە كاتیەكان كەلێنەكانی پڕدەكەنەوە، بۆیە گەر بڕیارێك لەم بارە و بەم بنەمایانە بدرێ لەلایەن مرۆڤەكەوە، كاتێ خۆی ئەبینێ واقو وڕماوە لەوبارەی ئەو تیایەتی، دەكرێ جۆرەها رەفتاری پاشەگەزبوونەوە بكات.

ئەم تێنووسە دەكرێ لە تەمەنی مرۆڤدا چەندەها جار گۆرانی بەسەردابێت و بنەماكانی هەمواربكرێ و سەردێرەكانی پێچەوانە بكرێتەوە، بەڕادەیەكی نزیكە ڕەها لە پێش تەمەنی پێگەیشتن روودەدات كە ناتواندرێ دیاربكرێ، بەشێوەیەكی گشتیش تا تەمەنی بیستەكان[٨].. .

هەروەك چۆن ددانی شیری لە تەمەنێكدا دەكەون و ددانی هەمیشەیی پەیدا دەبێ، مرۆڤ لە تەمەنی هەرزەكاریدا لەسەر چەند بنەمایەك ژیانی بەرێوەدەبات، كاتێكیش رووەو پێگەیشتن هەنگاو دەنێ یەكە بە یەكەی ئەم بنەمایانە پوچەڵدەبێتەوە و كۆمەڵە بنەمایەكی نوێ و نیمچە هەمیشەیی شوێنی دەگرێتەوە

٨- هەروەك ئەو بەرزە خوودەی (سیگمۆند فرۆید) باسی كردووە كە دەڵێ: ناوەرۆكی بەرزە خود پتر لە سەردەمی منداڵیەوە دروست دەبێت هەرچەند جێگیر نیە و دەكرێ لە داهاتوودا بە زیادبوونی ئەزموون و رۆشنبیری كەسەكە گۆرانی بەسەر بێت. بڕوانە: د.رزگار محمد قادر، چەند وانەیەك لە تاواnناسی، بەرگی یەكەم، چ١، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٨٧.

لە تێنووسەکەیدا، هەر بۆیە شەریعە و قانون بە کەسێکی دادەنێن توانای بریاردانی بریاری گرنگ و کاریگەری نیە، بۆ نموونە ناتوانی بە تەنیا پارچە زەویەك بەناوبکات.

سەبارەت بە دیارکردنی ئەو تەمەنەی مرۆڤ بە پێگەیشتوو دادەنرێ کە گومانی ئەوەی لێ ناکرێ وەك مەسەلەی ددانی شیری لێبێت و بەستنەوەی ئەم بابەتە بە زەواج، دەبینین لە شەریعەدا دیار نەکراوە و مەزهەبەکانیش جیاوازیان لە نێوبەدی دەکرێ، بۆیە لەو ڕووەوە دەبینین کە قانوندانەر (خودا) و پێغەمبەر (ﷺ) نەیانویستووە ئەم تەمەنە دیاربکرێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەپێ ی هۆکارە کاریگەریەکانی شوێن و کات و هۆکاری دیکە دەگۆڕێ.

هەرچەند قانونی عێراقی تەواوکردنی (١٨) ساڵی و عەقلی کردووە بە مەرج بۆ شایستەیی زەواج (أهلية) ئەوا ڕێگەش دەدرێ بەوەی ١٥ سالی تەواوکردووە هاوسەریی ببەستێ بە ڕەزامەندی دادوەر و وەلی و هەمان چەشن بە پێی قانونی هەموارکردنی تەتبیقی قانونی باری کەسێتی کە لەلای پەرلەمانی کوردستان دەرکرا تەواوکەری ١٦ ساڵی بە ڕەزامەندی دادوەر و وەلی دەتوانی هاوسەریی پێکبهێنێ[٩].

ئەو ڕۆژانەی کە زانا ئاینیەکان باسیان لە تەمەنی پێگەیشتن کردووە زۆری بەسەرداچووە و زۆر گۆڕاوە و جیاوازە لەو ڕۆژانەی ئێستای مرۆڤایەتی پێیدا دەروا، بۆ نموونە ئەوسا مرۆڤ لەناو کۆمەڵگایەکی بچووك دەژیا و بەدەگمەن یەکێکی وایان تێدابوو هاتوچۆی کۆمەڵگایەکانی دیکە بکات، ئەوسا ئافرەتەکان لە ماڵدا جێگیر دەبوون و نەدەچوونە دەرەوە، هەرکەسە لە بچووکیەوە فێرە کارێك دەبوو بۆیە زوو سەرچاوەی داهاتی خۆی دەزانێ و تا تەمەنی تەواو دەبوو هیچ گۆڕانێکی ئاوها لە ژیانی ڕووینەدەدا شایەنی باس بێ، کۆمەڵێ بابەتی دیکەش وایانکردووە زوو ببێتە بالغ بە گوێرەی ژیانێکی سادەی ئاوها و لە سنووری کۆمەڵەیەکی تەسك و نەبوونی تەکنەلۆجیای پەیوەندیکردن و داواکاریەکی کەم هاوسەر هەڵبژێرێ پاشان بەرەبابەکەی

٩- أنظر: فقرة (اولاً)، المادة (٥)، قانون رقم (١٥) لسنة (٢٠٠٨)، قانون تعديل تطبيق قانون الاحوال الشخصية رقم (١٨٨) لسنة (١٩٥٩) المعدل في اقليم كوردستان — العراق.



ئاهەنگی بووك گواستنەوەی بۆ بکەن، بەمەش تەمەنێکی درێژیان بەیەکەوە بەسەر دەبرد بێ ئەوەی هۆکارێکی تێکدەر روویان تێبکات و هیتر ئارەزوویان لەو ژیانە نەمێنێ. ڕاستیانکردووە کە ئەمانە لە تەمەنێکی بچووك پێگەیشتوونە لە ناو ئەو بارودۆخەی تێیدابوونە بێ باسکردنیش یەکجار جیاوازی هەیە لەو بارودۆخانەی ئێستا تێیدا دەژین کە کۆمەڵگاکان تێکەڵبوونە و سنووری دەوڵەتەکان کراوەن و جۆرەها ئامرازی گەیاندنی ئەلکترۆنی و فیزیایی لە ئارادایە ...هیتر، هەر هەموویان بوونەتە هۆی دروستکردنی مرۆڤێکی جیاواز لە بۆچوون و سروشت و تێنووس و فەلسەفەیان لە ژیان. ئەم بارودۆخە پێگەیەکی وەهایان لێ درووست بووە کە مرۆڤەکان تا تەمەنێکی گەورە بەدوای خۆشگوزەرانی و لەکس دا وێلبن و لە حیکمەتەکانی ژیان بێ هەوال بن، بە تایبەتی کە وڵاتە پێشکەوتووەکان هەردەم لە پێشکەوتن بوون لە کاتێکدا کوردستانمان کۆت و بەند بووە و پاش سەربەخۆییمان لەو بارەی خۆمان ئاسمانەکانمان خێرا تەقینەوە و باوەشمان بۆ جۆرەها بیرۆکە و تەکنەلۆجیا و ستایلی نوێی ژیان کردەوە کە بە شێوەیەکی ئاسایی نەبوو، ئێستاش لە گەشەسەندنێکی خێرایە بەتایبەتی هەولێری پایتەخت.

لە کۆندا زۆر بە گران کچ و کوڕ گفتوگۆیان بەیەکەوە دەکرد و بەدیداری یەکتر دەگەیشتن و هاوڕێیەتی نێوانیان ئەستەمبوو و بەگشتی جیهانی هەردوو لایەن تێکەڵنەبوو، ئەمە کاریگەری هەیە بەڵام کاریگەرە گەورەکە لەوەیە کە ئیستا بە هۆی سەتەلایت و هەزارەها کەنالی ئاسمانی و جۆرەها بەرنامەی جیهانی وا لەو مرۆڤانە دەکات لەسەرەتای تەمەنیان وێڵبن لەو جیهانە و مرۆڤی چاك لە مرۆڤی خراپ نەکەنەوە و هەڵخەڵەتێن بە مەرجی لابەلا، کە ژیانی هاوسەرییش پێکدەهێنن ئەم بنەمایە وەك ددانی شیری دادەڕمێت و ڕەزامەندیەکەش نامێنێت، ئینجا وا هەست دەکەن کە ئەو هاوسەرەی دەیانویست ئەمە نەبوو و بەبێ بنەما بریاریانداوە، ئینجا ڕەش و سپی خۆیان لەیەکدەکەنەوە. تاکە چارەش بۆ ئەو جیهانە دارماوە زۆر جار کۆتایی هینێنان و هەلوەشانەوەیە هەروەك ئەم خاڵەمان بۆ سەلما لە توێژینەوەمان لەو بوارە لە دادگای باری کەسێتی و لە چاوپێکەوتنەکانمان لەگەل شارەزایان.

کەوابێ ئەو بنەمایانەی ڕێگەیان بە تەواوکەری تەمەنی (١٥) ساڵی و بەپێی هەموارەکەش تەواوکەری (١٦) ساڵی دەدا بە زەواج ئێستا بوونیان نەماوە و دروست بوو لەسەر بەتاڵ بەتاڵە، ئەم زەمانەمان ڕێگە بەم کەسانە نادات. تا ئەو تەمەنە زۆربەی کەسەکان لە باوەش دایك و باوکیان بوونە یان گەر کاریشیان کردبی بە گشتی هۆکارە ورووژینەرەکان ڕێگەی پێان نەداوە پێبگەن و تێنووسەکەیان پڕ بکەن لە حیکمەت و فەلسەفەی زەواج و هێشتا شارەزاییان لە سروشت و ویستی خۆیان پەیدا نەکردووە، بەمە زوو قەناعەتیان پێ دەهێنرێ بۆ ڕازیبوون بە یەکێك ببێتە هاوسەری ژیانیان. بۆیە با ڕێگە بدرێ جارێ لە سروشتی خۆیان شارەزابن ئینجا بچنە ناو ژیانێکی فرە حیکمەتی وەها.

گەر تێبینی بکەین ئێستا زۆربەی ئەو تەلاق و جیابوونەوانەی ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی خێزانێکی تەمەن بچووك ئەو هاوسەرانەن کە لە تەمەنی (١٥-١٩) ساڵی چۆنەتە ناو ئەو ژیانەوە[١٠] کە دەبێتە هۆی :

١. نەگبەتی و گرێی دەروونی و ڕەشبینی لە ژیان و بڕینی باڵی ئەو مرۆڤانەی جارێ چی وایان لە ژیان نەبینیووە.
٢. بەرز کردنەوەی تاوانە مەترسی.
٣. خۆکوشتن.
٤. لە خشتە چوونی کەسێك لەوانەیە زۆر گرنگ بێ بۆ دوارۆژ.
٥. کۆچکردن بۆ هەندەران.
٦.لادانی منداڵان (انحراف).
٧. تێکچوونی ژیانی کۆمەلایەتی و باری ئارامی و ئاسودەیی خۆشگوزەرانی ..هیتر.

پێویستە و چاکتر وایە ڕێگە بە کەسەکان بدرێ چاویان بکەنەوە لە ژیان ئینجا ڕێگەیان پێبدرێ بە پێکهێنانی ژیانی هاوسەریی.

١٠- د.مەعن خەلیل، کۆمەلناسی خێزان، وەرگێرانی: ئارام ئەمین جەلال، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٧، ل ٢٢٣.



## ٢-١- ڕێگەچارەی فاکتەری بچووکی:

### ١-٢-١- مشتومڕی تەمەنی پێگەیشتن لە شەریعە و فقە:

لە شەریعەی ئیسلامی چ لە قورئان چ لە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) تەمەنی پێگەیشتن دیاری نەکراوە[١١]، بۆیە دەگەڕێینەوە سەر دۆکترینەکان[١٢].

دۆکترینەکان بێنەوبەرەیەکی زۆریان لە نێواندا هەیە سەبارەت بە تەمەنی پێگەیشتوویی. کەسێك بە پێگەیشتوو دادەنرێ ئەگەر نیشانە سروشتیەکانی پێگەیشتنی هەبێ ئەوەش ئیحتلامە لە کوڕ و سوڕی مانگانەیە لە کچان یان مەزندە دەکرێ بە تەمەن، جمهووری دۆکترینەکان دەڵێن دەستپێکی پێگەیشتن لە کور (١٢) ساڵیە و لە کچ (٩) ساڵی و کۆتاکەش (مانای پێگەیشتن لەو تەمەنە تێناپەرێ) (١٥) ساڵیە بۆ کچ و کور. بەلام ئیمام حەنەفی دەڵێ کۆتاکەی (١٨) ساڵیە بۆ کور و (١٧) ساڵیە بۆ کچ[١٣].

لەسەر ئەمە بچووکی جیانەکراوە (الصغیر غیر الممیز) بە یەکجاری گرێبەستی هاوسەری بۆ ناکرێ، بەلام بچووکی جیاکراوە (الصغیر الممیز) ❶لەلای دۆکترینە حەنەفیەکان گرێبەستی هاوسەری بۆ دەکرێ بەلام ڕاگیراو دەبێ لەسەر ڕێپێدانی وەلیەکەی.❷لەلای شافعی وەك بچووکی جیانەکراوە ناتوانرێ گرێبەستی هاوسەری بۆ بکرێ.

پێگەیشتوو، لە ڕوانگەی جمهوور ئەگەر نیشانە سروشتیەکانی پێگەیشتنیان تێدا دەرنەکەوت ئەوا خۆی دەتوانێ هەڵسێ بە بەستنی گرێبەستی هاوسەری کاتێك

١١- د.حسام الدین عفانة، الزواج المبکر، متاح علی الموقع:
.<http://www.yasaloonak.net >

١٢- فقهاء.

١٣- د.مصطفی السباعی، شرح قانون الاحوال الشخصیة، ج١، دار الوراق، ٢٠٠٠، بیروت، ص١٢١.

دەگاتە (١٥)ساڵی بەبێ گەڕانەوە بۆ وەلی و ڕاگرتنی لەسەر ڕێپێدانی وەلی. بەلام لە ڕوانگەی ئیمام حەنەفی (١٨) ساڵی داناوە بە کۆتای پێگەیشتن لە لای کوڕ، بۆیە پێش ئەوکاتە ناتوانێ بە خودی خۆی هەڵسی بە بەستنی گرێبەستی هاوسەری[١٤].

## ١-٢-٢- چارەسەری ئەم فاکتەرە:

لەسەرەتا پێویستە بزانین مەزهەب هەرچەندە گەورەبێ (اجتهادە) مانای بۆچوونە، (مقدس) نی یە بەڵکو (مقدرە) بە واتای پیرۆز نیە بەڵکو بە مەزەندەیە، ڕێزی لێدەگیرێت بەلاّم مەرج نیە پەسەند بکرێت[١٥]، بۆیە ئەگەر هاتوو دەستکاری ئەو تەمەنە کردرا کە تێیدا ڕێگە دەدرێ بە زەواج لە قانونی باری کەسێتی ئەوا مەبەست لە دەرخستنی بێڕێزی نیە بۆ ئەو مەزهەبە، و "زۆرینەی زاناکان و دۆکترینە ئیسلامیەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە مافی دیاری کردنی تەمەنی هاوسەری بە تەمەنێکی دیارکراو بەپێی بەرژەوەندی خەڵکە و ئەم بەرژەوەندیەش لە دەمێکەوە بۆ یەکێکی تردەگۆڕێ"[١٦].

بەرژەوەندی کۆمەڵگا وادەخوازێ دوو هاوسەرەکە توانستی هەڵسان بە ئەرکە هاوسەرییەکانیان هەبێ و ڕێزگیربن بۆ پیرۆزی هاوسەریی و پابەندیە ئەدەبی و کۆمەلایەتیەکان[١٧] ..هیتر.

١٤- انظر: د. مصطفى السابعى، المصدر السابق، ص١٢٢.

١٥- بڕوانە: پارێزەر: بکر حمەصدیق عارف، ڕەهەندە فقهی و کۆمەلایەتیەکانی قانونی باری کەسێتی و چەند سەرنجێك، گۆڤاری پارێزەر، ژمارە (٢٢) ساڵی ٢٠٠٤، ل٤٩.

١٦- فاضل عباس، تنظيم سن الزواج ليس مؤمرة، متاح على الموقع: <<http://www.ahewar.org، والنص باللغة العربية:"...ان غالبية العلماء و الفقهاء الأسلامية يؤكدون ان الحق فى تقيد سن الزواج بسن معين طبقا لمصلحة الناس و هذه المصلحة تتغير من فترة الى اخرى..."

١٧- انظر: د.مصطفى السابعى، المصدر السابق، ص١٢٣.



بەلاّم ئێستا ژیان زۆر ئالۆزتر بووە و تێگەیشتن و پێگەیشتن پێویستی بە شارەزاییەکی ڕێژەیی ئەوتۆ هەیە بەلایەنی کەم کەسەکە بتوانێ سبەی واقی ورنەمێنێ لەو زەواجەی ئەو تیایەتی. هەڵبەت لە بەرژەوەندی کۆمەلگادانی یە ڕێگە بە کەسێ بدرێ چ کوڕ چ کچ بە پێکهێنانی هاوسەری بێ ئەوەی گەیشتبێتە پێگەیشتنێکی ڕێژەیی هزری، شارەزاییەکی دارایی، زانیاری بە کار و باری ژیان، توانست بۆ هەڵسان بە ئەرکە هاوسەرییەکان[١٨]، گەرچی گرانە ئەم لایەنانەی پێشوو لە کەسێکدا دیاری بکرێ ئینجا ڕێگەی پێ بدرێ بە زەواج، لەگەڵ ئەوە پێویستە ڕێگە نەدرێ بەوانەی نەگەیشتونەتە تەمەنی قانونیی کە تەواوکردنی ١٨ ساڵیە[١٩] بۆ زەواج. مەبەست لێرە لە تەواوکەری شانزە ساڵیە کاتێك داوای زەواج دەکات[٢٠] سەبارەت بە لەکاروەستانی ماددە (٨) لە روحی ئەو مەبەستەی بۆی دانراوە (ئەمەش لە بڕگەی داهاتوو باس دەکەین). دادوەری باری کەسێتی (ڕەئوف محمد شەریف) لە دادگای باری کەسێتی هەولێر ئاماژەی کرد بەم بوارە ووتی: (زۆر گرفت دروست دەبێ لەوانەی تەمەنیان بچووکە و هاوسەریی پێکدەهێنن چونکە زۆربەیان وادەزانن پێکهێنانی هاوسەری = سێکس[٢١] و فکر لە هیچ لایەنەکانی دیکە ناکەنەوە، من پێشنیار دەکەم چیتر ڕێگە بەوانە نەدرێ و تەمەنی شایستەیی زەواج بەرزکرێتەوە بۆ ٢٠ ساڵ)، ئەمە و رای دادوەرەکان و توێژەری کۆمەلاّیەتی ئەو دادگایە هەمان بۆچوونیان هەبوو.

١٨-انظر: د.مصطفى السابعى،المصدر السابق، ص١٢٢.

١٩- انظر: مادده (٧) فقرة (١) من قانون الاحوال الشخصية رقم (١٨٨) لسنة (١٩٥٩) المعدل.

٢٠- کچ و کوڕ لەو تەمەنە ناگونجێن بۆ زەواج، ئەوان خۆیان بەپیی قانون متحضونن، زەواجێکە ماوەکەی زۆر کورتە و ئەنجامەکانی خراپە:

انظر: د.احمد علي الخطيب و د.حمد عبيد الكبيسي و د.محمد عباس السامرائي، المصدر السابق، ص٤٧.

٢١- هەروەك لە ڕوونکردنەوەکەی خۆی ووتی: نموونەی بچووکەکان (خوار تەمەنی تەواوکردنی هەژدە ساڵی) وەك برسیەك وەهایە هەرچ خواردنێکی بۆ بهێنی حەپەلوشی دەکات، تەنها دوای تێربوون دەستدەکات بە ڕەخنەگرتن لە خواردنەکە سوێربوو، خەستبوو، ناخۆشبوو، بێ تامبوو... .

سەبارەت بە (تەواوکەری شانزە ساڵی و تەواونەکەری هەژدە ساڵی)[22] کە بە بچووکی جیاکراوە دادەنرێ، با بۆچوونی ئیمام شافعی[23] وەربگیرێ کە بە هیچ شێوەیەك رێگەی بە بەستنی گرێبەستی هاوسەری نادات. بە پشت بەستنیش بەو بنەما دۆکترینەی کە دەڵێ (**لاينكر تغير الاحكام بتغير الازمان**)، کورتەی ئەم بنەمایە ئەوەیە کە ئەو ئەحکامە بەشیانەی پەیوەندی بە رێکخستنی پەیوەندییە مرۆییەکان هەیە لە رووی دارایی و کارگێری و تەندروستی و ئابووری... هیتر یان ئەوەی وەکو ئەوانەیە ئەوا دەگۆڕێ بە پێی گۆڕانی نەریت و پێویستیەکانی ژیان، ئەم بنەمایەش ئەو ئەحکامانە ناگرێتەوە کە دەقێکی لەسەرە دەلالەتێکی قەتعی دەدات لەسەر بابەتەکە وەك بنەمای بەشی پیاو دوو بەشی ئافرەتە لە میرات، ئەحکامی ئیعتقادیەکانی ناگرێتەوە وەك باوەڕبوون بە خودا، ئەحکامە پەیوەندیدارەکان بە خودا پەرستی ناگرێتەوە وەك نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەج...، ئەحکامی ئەخلاقیی وەك راستگۆیی و دڵسۆزی ... ناگرێتەوە، چونکە ئەمانە لەلای خوداوە جێگیر کراون[24]. وەك ئاشکرایە ئێستا بەرژەوەندی گشتی و پێویستی ژیان وادەخوازێ رێگە لەوانە بگیرێ کە (١٨) ساڵیان تەواو نەکردووە چونکە رۆڵێکی مەزنیان هەیە لە بەرز بوونەوەی تەلاق و جیابوونەوە.

٢٢- راسپاردەی تایبەت بە رەزامەندی و تەمەنی دونیا و تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەری(١٩٦٥)، کە لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٦٢) دەڵێ: (پێکهێنانی هاوسەری لە تەمەنێکی بچووك سەرپێچیکردنی منداڵیە).
أنظر: هدى عصمت محمد أمين، الحضانة في قانون الأحوال الشخصية العراقي و الأتفاقيات الدولية، رسالة ماجستير قدمت الى جامعة صلاح الدين-اربيل، ٢٠٠٦، ص ١٢٧.

٢٣- د.مصطفى السباعي، المصدر السابق، ص١٢١.

٢٤- د.مصطفى الزلمي و عبدالباقي البكري، المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية، بيت الحكمة، بغداد، ١٩٨٩، ص٢٨٩-٢٩٠.



لێرەدا پرسیارێك وەلامدانی پێویستە: چۆن مامەڵە بکردرێ لەگەڵ ئەو کچ و کوڕەی نەگەیشتوونەتە تەمەنی قانونیی و پەیوەندی ناشەرعیان لە نێواندا روویدا(پەیوەندی سێکسی)؟

دەبێ ئەوە بزانین لە رووی شەریعەوە ئەو کوڕ و کچە لە دوو حاڵەتدا دەشێ هاوسەری پێکبهێنن ❶هەردووکیان تۆبەیان نەکردبێ ❷هەردووکیان تۆبەیان کردبێ و پەیمانیان بە خودا دابێ نەگەڕێنەوە ئەو کارە[25]. بۆچی سنووری هاوسەری لە رووی شەریعەوە بۆ ئەوانە تەسککراوەتەوە!. بەلام سەبارەت بەوەی ئایا رێگەیان پێ بدرێ یان نا، ئەوا با ئێمە لەوە دڵنیابین ئەگەر رێگە بەو جۆرە زەواجانەدرا فەسادی ئەخلاقیی و زینا زۆر پەرەدەسێنێ، لەلایەك زینا وەك ئامرازێك بەکار دەهێنرێ تا رێگری قانونیی نەمێنێ لەبەردەم ئەو کچ و کوڕانەی پەیوەندی سۆزداریان لە نێوان هەیە بەلام نەگەیشتوونەتە تەمەنی قانونیی و قانون رێگە بە زەواجیان نادات، بەمەش فەسادی ئەخلاقیی و زینا بلاودەبێتەوە، لە لایەکی تریش دادگا و قانون توشی رێبزری و درۆ و خۆدەرخستن دەبێ بەوەی پەیوەندی ناشەرعی لە نێوان کچ و کورەکە هەیە تا رێگەیان پێ بدرێ بە بەستنی گرێبەندی هاوسەری، بۆ نموونە داواکارانی زەواج و کەس و کاریان بە دادگا دەڵێن پەیوەندی ناشەرعی لەنێوان کچ و کوڕەکە هەبووە، جا چیتر ئەو حیکمەتەی ئەم قانونە لە پێناوی دانرا نامێنێ. گەر دادگا داواکاری ئەوانە رەتبکاتەوە ئەوا ترس زیاتر دەبێ لەسەر ئەم کارە هەرەسهێنەرەی کۆمەڵگا و بەرژەوەندی گشتی، هەروەها رۆڵێکی بەرچاوی دەبێ لەسەر کەمکردنەوەی.

لە لایەکی دیکە زۆربەی زۆری ئەو حاڵەتانەی کە کچ و کوڕەکە ئەو جۆرە پەیوەندییەیان لە نێوان رووەدەدات کەس و کاریان ناچاریان دەکەن (ئیکراهیان دەکەن)

٢٥- أنظر: د.محمد عبدالمقصور عفيفي و محمد بن صالح العثيمين و محمد ناصرالدين الألباني و صالح بن فوزان الفوزان و شيخ الاسلام ابن تيمية و عبدالله بن عبدالرحمان الجبرين و عبدالعزيز بن عبدالله بن باز و محمد بن ابراهيم آل الشيخ و عبدالرحمان بن ناصر السعدي و اللجنة الدائمة للافتاء، فتاوي المرأة المسلمة، دار ابن هيثم، قاهرة، ٢٠٠٢، ص٣٠٥-٣٠٦.

لەسەر زەواج، ناچارکردنش لە بەستنی گرێبەستی زەواج گرێبەستەکە پووچ(بەتاڵ) دەکات[٢٦] بە پێی قانون.[٢٧]

پاشان ئەو جۆرە زەواجانە زۆر بە کەمی سەردەکەون و لە بنەرەتدا ئەوانە بە چاوی سووك و ڕق و کینەوە تەمەشای یەکتردەکەن جا چ جای خێزانێکیان لێ پەیدا دەبێ و هێشتاش پێنەگەیشتوونە. ئامرازەکانی جێبەجێ کردنی ئەم بڕگەیە لە بڕگەی داهاتوو (١-٣) باسیدەکەین.

---

٢٦- انظر: ماده (٩) فقرة (١) من قانون الاحوال الشخصية رقم (١٨٨) لسنة (١٩٥٩) المعدل. لە راستیدا بە پێی هەمواری ژمارە (١٥)ی ساڵی (٢٠٠٨)ی قانونی باری کەسێتی، ئەو گرێبەستە هاوسەریەی بە بەتاڵ داناوە کە بە زۆەملێ بەستراوە ئەگەر دخول روینەدابێ لە نێوان کچ و کورەکە و بە راگیراوی داناوە ئەگەر دخول رویدابێ، بەڵام لەبەر ئەوەی زینا جێگەی دخول ناگرێتەوە بۆیە گرێبەستێ پاش زینا بە زۆرەملێ پێکهێندرا بە بەتاڵ دادەنرێ.

گەرچی هەژمارکردنی گرێبەستی هاوسەریی ناچاری بە راگیراو بە روودانی دخول، ناشارەزایی قانون دانەری کوردستانی بەدەردەخات سەبارەت بە سروشتی گرێبەستی بەتاڵ چونکە ئەم گرێبەستە لە بنەڕەتدا بوونی نەبووە و هیچ شوێنەوارێك دروست ناکات، دروستیش نیە ناونری گرێبەست ، هەتا ئەگەر دوای ئەوە لایەنەکانی گرێبەستەکە رەزامەندی خۆیان دەبری لەسەری ئەوا هیچ کاریگەری نابێ لەسەر دروستبوونی چونکە گرێبەستێ بوونی نەبێ بە رێپێدان نایاته وجود، بەڵکو دەبێ دووبارە لەسەرەتاوە گرێبەستەکە پێکبهێننەوە ئەگەر لە تواناداب‌وو بە دروستی پێکبهێنرێ. پێویست بە بریاری دادگاش ناکات تا بە بەتاڵ دانرێ بەڵکو بە ئۆتۆماتیکی ئەم چارەنووسە وەردەگرێ. بروانە: د. عبدالمجيد الحكيم و عبدالباقي البكري و محمد طة البشير، الوجيز في نظرية الالتزام في القانون المدني العراقي، الجزء الاول في مصادر الالتزام، ١٩٨٠، ص ١٢٠-١٢٤.

٢٧- قانونی چاودێری ناکامەکانی ژمارە (٧٨) ی ساڵی (١٩٨٠) لە جێبەجێکردنی بچووکی تەواونەکەری ١٨ ساڵی دەگرێتەوە، بڕوانە مادە (٣) بڕگە (١) ی قانونی ناوبراو.



## ١-٣- رۆڵی قانون:

### ١-٣-١- رۆڵی چاکسازی لە قانونیی عێراقی لەم ڕووەوە:

بەپێ ی ماددەی (٧) بڕگە (١)ی قانونی باری کەسێتی ژمارە (١٨٨) ساڵی (١٩٥٩)ی هەمواركراو، کەسێك ئەهلیەی هاوسەریی بە تەواو دادەنرێ ئەگەر (١٨) ساڵی تەواوکردبێ و و ئەقلّ و هۆشی تەواوبێ (يشترط في تمام اهليه الزواج العقل و اكمال الثامنة عشرة) [٢٨]، بەڵام ئەم ماددەیە رۆڵی خۆی بەرێژەیەك لەدەستداوە بەپێ ی ماددە (٨) ی هەمان قانون .

سەبارەت بە (تەواونەکەری هەژدە ساڵی)، دەیکەین بە دوو بەش:

**یەکەم. لە بارێکی ئاسایی دا:** لە ماددەی (٨) بڕگە (١)[٢٩] ی قانونی ناوبراودا هاتووە ئەگەر کەسێ ١٦ ساڵی تەواو کردبێ و داوای بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیری بکات دەبێ:

① شایستەیی هاوسەریی (أهلية الزواج) هەبێ.

② توانای جەستەیی هەبێ.

③ وەلیەکەی ڕازی بێت یان لاریەکەی شایانی رەچاوکردن نەبێ.

بەپێ ی مەبەست و ڕوحی ئەم ماددەیە تەنها رێگە دەدرێ بەکەسێکی پێگەیشتوو، تێگەیشتوو، شارەزا لە ژیان، خاوەن توانا لە بەرێوەبردنی خێزان و ئەرکە دارایی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان ...، و بەڕاستی کەسێك گەر وەهابێت ئەوا

---

٢٨- ئەم بڕکەیە هەموارکرا بەپێ ی قانونی ژمارە (٢٠) بۆ سالی (١٩٧٨).

٢٩- المادده (٨) فقرة(١) من قانون الاحوال الشخصية رقم (١٨٨) لسنة (١٩٥٩) المعدل: (اذا طلب من اكمل السادسة عشرة من العمر الزواج فللقاضي أن يأذن به اذا ثبت له اهليته و قابليته البدنية بعد موافقة وليه الشرعي، فاذا امتنع الولي طلب القاضي منه موافقته خلال مدة يحددها له فان لم يعترض او كان اعتراضه غير جدير بالاعتبار اذن لاقاضي بالزواج).

شایەنی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرییە. بەلاّم دادگا ناتوانیّ و لە توانایدا نیە لە بوونی ئەم مەرجانە بکۆڵێتەوە تاوەکو بیکاتە بنەمای ڕێگەدان بەم زواجە، هەروەك لە توێژینەوەمان لە دادگای باری کەسێتی هەولێر بۆمان دەرکەوت کە ئەم ماددەیە داوای کۆمەڵە شتێك دەکات لە دەرەوەی توانستی دادوەرە، دادوەریش کە کاری تەتبیقکردنی قانونە تاکە ئامراز کە لە توانایەتی بۆ بەدیهێنانی ویستی ماددە (٨) برگە (١) تەنها چاوێتی، بێگومان ناتوانرێ بەچاو و تەماشاکردنێ بزانرێ ئایا ئەم کوڕە یان ئەم کچە پابەندیەکانی خۆی و خێزانەکەی دەتوانیّ هەڵگرێ یا نە، بۆیە لە دادگا مەحالّە داواکاریەك لەم جۆرە رەتکرێتەوە کە دیسانەوە بەڵگەیە لەسەر تەتبیق نەکردنی ماددەکە. دادوەران و داواکارانی گشتی و توێژەرەوەی کۆمەلایەتی دادگای ناوبراو جەختیان لەسەر لەکارکەوتنی ئەم ماددەیە کرد و دادوەر(رەئوف مەحەمەد) دوای خستنەڕووی ئەم پێشنیارەمان بۆی ووتی: "ئێمە تەنها دەتوانین تەماشای رووخسار بکەین، خۆ ئەگەر لە رۆژێکا دەعوامان زۆر بێت ئەوا بەس تەماشای تەمەن دەکەین". ئێمە وافکر نەکەینەوە کە هەڵەی دادوەرەکان بێت یان کەمتەرخەمی ئەوان بێت بەڵکو شتێکی سەروو توانای ئەوانە، خۆشیان دانیان بەوەنا کە ئەم ئەرکەی قانون خستویەتیە سەریان لە توانای ئەوان نیە.

**٢. لە باری نائاسایی** (پەیوەندی ناشەرعی): لە ماددەی (٨) برگە (٢) دا هاتووە کە دادوەر دەتوانیّ ڕێگە بە تەواوکەری ١٥ ساڵی بدات ئەگەر ئەوپەری پێویستی لە ئارادابوو بەلام دیسان دوو مەرجی دیکەی داناوە تاوەکو بکرێتە پێوەر بۆ ڕێپێدان: ❶پێگەیشتوو بێت لە رووی شەرع ❷توانای جەستەیی هەبیّ. ئەمەش هەمان باری برگەی(١) ماددە (٨)ە کە دانانی ماددە (٨) هەولێکی بێ هۆدەیە و مەبەستی خۆی نەهێناوەتە دی کە لە خالّی پێشوو باسمانکرد. جگە لەمە هیچ حیکمەتێك بەدیناکەین لەوەی قانون دانەر جیاوازی کردووە لە مەرجی تەمەن لە خالّی یەکەم و دووەمی پێشوو.



بۆیە هەروەکو پێشتریش باسمانکرد، پێویستە ڕێگە بگرترێ لە (تەواوکەری پانزەساڵی-نەگەیشتوو بە هەژدە سالی) و ماددە (٨) ی قانونی باری کەسێتی ژمارە (١٨٨) ساڵی (١٩٥٩) هەموارکراو پوچەڵبکرێتەوە بەبیّ هەوڵدان بۆ هەمواركردن [٣٠].

**سەبارەت بە جیاوازی تەمەنی نێوان دوو هاوسەرەکە:** لەراستیدا زۆربەی ئەو هاوسەرییانەی جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان تەمەنی کچ و کورەکە پێویستی بەزیرەکیەکی زۆر نیە تا مەبەستی فێلاّنەی ئەو زەواجە تێبگەین و گومانلێکراون[٣١] بۆیە ئەم بارە دەبیّ لە قانونی باری کەسێتی دەقی لەسەر هەبیّ و دادوەر ئاگادار بێت، ئەگەر لەم زەواجانە بەگومانبوو ئەوا بتوانیّ رەتیبکاتەوە بەتایبەتی جیاوازی تەمەن لە (٣٠) ساڵ بە دواوە.

ئەگەر قانون بە ووردی و پتەوی دانەنرا و ئەو پەرلەمانەی پێکیدەهێنیّ دەربڕی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگا نەبوو، ئەوا لەو دەقە قانونانەی کە دەریدەکات چەندەها دەرەنجامی خراپ و زەرەروزیانی لێدەکەوێتەوە، جگە لەوەی هەڵەی زۆری تێدا بەدیدەکریّ.

لەکاتێك پەرلەمان لەلایەن گەل هەڵبژێردراوە وەکو نوێنەرێك و دەربڕی ویستەکانی، کەوابیّ ئەو پەرلەمانە شەوخونی دەکات لەسەر پێدوایستیەکانی ئەو گەلە و کاتێك کێشەیەك یان قەیرانێك دروستدەبیّ ئەوا چالاکیەکانی رووەو

٣٠- لە توێژینەوەیەك کە لە ولاّتی بەحرێن کردرا، ئەوە سەلمێنراوە کە بەرزکردنەوەی تەمەنی هاوسەری رۆڵێکی گرینگی هەیە لە کەمکردنەوەی تەلاق، تیایدا هاتووە: بەرزبوونەوەی تەلاق دەگەرێتەوە بۆ کەمی هزری دوو هاوسەرەکە، خراپی هەلبژاردن، رێزنەگرتن لە ژیانی هاوسەری، خراپی باری ئابووری، ئەمانەش هەموویان هۆیەکەی زەواجکردنە لە تەمەنی بچووك... :
انظر: فاضل عباس، المصدر السابق.

31- Judith Milliken and Treror Todd، Mental Capacity and marriage "Feature Report on Older Adults and the law"، Published in spring 2006، University of Alberta.

چارەسەری ئەو بابەتە ئاراستە دەکات، هەروەها کار و پێشنیار و ئەو قانونانەی کە دەریدەکات ڕەنگدانەوەی کەلتوور و بیروباوەڕی ئاینی و داب و نەریت و ڕەوشت و پێداویستی ئەو گەلە دەبێ. ئەگەر بەم بنەمایە کارینەکرد ئەوا شەرعیەتی خۆی لەدەستدەدات.

ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان (پەرلەمان) لە (٢٠٠٨) هەڵسا بە هەوارکردنی قانونی باری کەسێتی کە لەراستیدا زۆر پێویست بوو، بەڵام ئەوەی جێگەی پرسیارە لەبری ئەوەی هەڵسێ بە گفتوگۆکردن دەربارەی قەیرانی زۆربوونی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی و قەیرەیی کە بە گەورەترین و مەترسیدارترین چەڵەمە دادەنرێن لەم بوارە، خۆی سەرقاڵکرد بە چەند بابەتێکی لابەلای دیکە.

لێرەدا چەند پرسیارێك رووندەبێتەوە، ئەویش: ئەو هەمووارکردنەی ئەنجامدرا چی چارەسەرکرد؟ کێ داواکاری ئەم هەمووارکردنە بوو ئایا دەنگۆیەك لەناو کۆمەڵەگا هەبوو کە ئەو دەقانەیان لەلا بووبێتە کێشە؟ ئایا قەیرانێ هەبوو لەناو کۆمەڵگا بەو هەموارەی کردراوە چارە بکرێ؟ چەند پرسیارێکی دیکەش.

لە پاڵ ئەمانەش چەند هەڵەیەك روویدا، چ لە رووی قانونی چ لە بوارەکانی دیکەش، لەم تەوەرەیەدا تەنها دەست دەداگرین لە بوارە قانونیەکە، نموونەش لەسەر ئەمە، بابەتی ئەو کەسەی داوای پێکهێنانی هاوسەریی دەکات و ١٨ ساڵی تەواونەکردووە، لە بەرزکردنەوەی تەمەنی لە تەواوکردنی ١٥ ساڵی بۆ تەواوکردنی ١٦ ساڵی، ئەوەبوو لە سەرجەم وتووێژەکان سەبارەت بەمە، هەتا کاتێ بووە پێشنیار و خرایە دەنگدان و دەنگیشی لەسەردرا، لەسەر بنەمای ئەوە تەمەنەکە لە ١٥ ساڵی بەرزکرێتەوە بۆ ١٦ ساڵی، کەچی دەبوایە بوترێ لە تەواوکەری ١٥ ساڵی بەرزکردێتەوە بۆ تەواوکەری ١٦ ساڵی، بەڵام پەسەندیش کرا و دواتریش لە تۆمارکردنی هەموارەکە نووسرا تەواوکەری ١٦ ساڵی، ئەمەش هەڵەیەکی مەزنە لە رووی قانونییەوە. چەند نموونەیەکی دیکەش هەیە لێرە دەرفەتی ئەوە نیە لێی بدۆێین.



قانون پێویستە میکانزمێکی پتەوی هەبێ تا بتوانێ مامەڵە لەگەل واقع بکات، تەنها کۆمەڵە دەقێك نەنووسینەوە و خۆمان لە خەتی سی و شەش بدەین و بڵێین خاوەن قانونین. جا کە دەروانیتە قانونی باری کەسێتی حالی حازری بەڕوونی بۆمان ئاشکرا دەبێ مەبەست چی یە.

قانون خاوەن سەروەریە، ئەگەر ئەم سەروەریە لەدەستدا جا بۆچی دانراوە! لە ولاتێکدا کە قانون سەروەری نەبوو بۆ کۆمەڵێ هۆکار دەگەرێتەوە[٣٢]، ئەوەی ئێمە لێرە گرینگی پێدەدەین زیاتر چۆنیەتی پێکهینانی هاوسەریی نوێیە لە رووی هەبوونی مەرجە قانونییەکان (تەنها تەواوکەری (١٨) ساڵی دەتوانێ هاوسەریی پێکبهێنێ و مەرجی دیکەش) و چۆنیەتی پارێزگاریکردن لێ ی و دەستگرتنەوە لە تەلاق، چەند چاکسازیەك هەیە تارادەیەك سەروەری بۆ ئەم قانونە دەگەرێنێتەوە لەم خالانەی خوارەوە باسیدەکەین:

### ١) سیستەمی ڕێپێدراوی قانونیی:

چیتر پیاوانی ئاینی ناتوانن سەرپەرشتیاری بەستنی گرێبەستی هاوسەریی بکەن، هەروەها دادوەرەکانیش خۆیان بەم کارە خەریك ناکەن، چونکە پیاوانی ئایینی گەر بەشێکیان بەراستی پیاوی ئاینی بن ئەوا بەشەکەی دی تەنها جلی پیاوی ئاینیان لەبەرە، جا خۆمان لەو جۆرانە بەم سیستەمە دەپارێزین، دادوەرەکانیش وەك پێشتر باسمانکرد کاری زۆریان لە پێشە و پێوەی سەرقالن ❶ناتوانن بڕۆنە ماڵەکان و جێی پیاوانی ئاینی بگرنەوە ❷ناشتوانرێ و عەمەلی نی یە هاولاتیان ناچاربکرێن بڕۆنە دادگا بۆ مارەبڕین.

ڕێپێدراوی قانونیی بە قانون ڕێکدەخرێ کێ یە و مەرجەکانی چی یە، ئەویش کەسێکە شارەزایە لە قانون و شەریعەت، کەوابێ دەکرێ خاوەن بڕوانامەی

٣٢- بروانە مامۆستامان: پ.ی.د.ڕزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ١٧٥-١٨٢.

شەریعەبێت وە شارەزایی لە قانون هەبێ یان بە پێچەوانەوە بڕوانامەی قانونی هەبێ و شارەزایی لە شەریعە هەبێ و پاش ئەنجامدانی کۆرسێکی خوێندن سیفەتی ڕێپێدراوی قانونیان بدرێتێ، کارودەسەلاتەکانی بریتیە لە رۆیشتن بۆ مالآن لەسەر داواکاری هاولاتیان بۆ بەستنی گرێبەستی هاوسەریی و دڵنیابوون لە مەرجە قانونیی و شەرعیەکان و بوونی ڕەزامەندی تەواو. ڕێپێدراوی قانونیی دەفتەرێکی پێ یە کە لە لایەن دادگاوە پێ دەسپێردرێ و هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی گرێبەستە هاوسەرییەکان لە ناو دەفتەرەکە و بەرپرسە لەو گرێبەستانەی ئەو تۆماریکردووە و سزای تایبەت بەخۆی هەیە ئەگەر سەرپێچی قانونی کرد لە کارەکەی.

بەم سیستەمە هەموو کێشەکان چارەسەر دەبێ و قانون بالآدەست دەبێ و مافی کەس ناخورێ و ئەوەی (١٨) ساڵی تەواو نەکردووە ڕیگەی نامێنێ تا دزە بکاتە ژیانی هاوسەریی چونکە تاکە ڕێگەی بانگێشتی ڕێپێدراوە ئەویش بەرپرسیارە لە کاری خۆی و هەرگیز بۆی جێبەجێ ناکات.

## ٢) سزای سەرپێچیکردنی سیستەمی ڕێپێدراوی قانونیی:

قانون مرەکەب نی یە لەسەر پەڕاو دەبێ ڕێگای خۆی بدۆزێ بۆ تەتبیق کردن و جێبەجێکردن [٣٣]، بۆیە ئەگەر قانون پێشێلکردرا پێویستە پێشێلکەر سزا بدرێ، ئەگەرنا قانون لە ئامۆژگاری زیاتر نی یە. بەم شێوەیە پێویستی وادەکات لە کاتێك و شوێنێکی دیاریکراو کارێك بە تاوان دانرێ یان نا [٣٤].

هیچ گرفتێك بۆ هاولاتیان دروست نابێت لە جیاتی ئەوەی بانگی مامۆستای ئایینی بکەن یان بچنە دادگا، بانگێشتی ڕێپێدراوی قانونیی دەکەن و گرێبەستەکەیان

٣٣-انظر استاذنا: د.محمد معروف ،محاضرات في قانون العقوبات العام (٢٠٠٧-٢٠٠٨)، القيت على طلبة كلية القانون و السياسة-قسم القانون-المسائى \جامعة صلاح الدين.

٣٤- جاسم العبودي، التجريم و العقاب في اطار الواقع الاجتماعي، دار الحكمة للطباعة و النشر، اربيل، ١٩٩٠، ص ٢٣-٢٥.



بۆ دەکات لە ماڵی خۆیان. بەلام سەبارەت بەوانەی (١٨) ساڵیان تەواونەکردووە یان هەرمەرجێکی قانونیی دیکەیان تێدا نی یە و هەڵسان بە بەستنی گرێبەستەکە لای پیاوێکی ئایینی، قانون بەم شێوەیە مامەلەیان لەگەل دەکات:

❶ گرێبەستەکە لەلایەن قانون و دادگا بەهەند وەرناگیرێ.

❷ پاشان بۆ ئەوەی ڕێپێدراوی قانونیی گرێبەستەکەیان بۆ بکات دەبێ دان بەوە بنێن کێ هەڵساوە بە بەستنی گرێبەستەکە (بێگومان ئەگەر مەرجێکی قانونیی تێدا نەبوو چاوەڕێ دەکرێ هەتا مەرجەکان دێنەدی بەپێی توانا).

❸ ئەو کەسەی گرێبەندەکەی بەستووە (پیاوە ئاینیەکە یا هەر کەسێکی جگە لە ڕێپێدراوی قانونیی) سزا دەدرێ بە زیندانیکردن (٥-١٠) ساڵ [٣٥] یان ئەو سزایە قانون دانەر بریاری لەسەر دەدات، ئەو کوڕەی کەلایەنێکە لە گرێبەستەکە سزا دەدرێت بە بەندکردن (١٥-٣٠) رۆژ و کچەکەش هەمان شێوە چونکە یەکسانیش وا دەخوازێ ئەم سزایانەش ڕاناگیرێ بەڵکو جێبەجێ دەکرێ ئەگینا دیسانەوە دانانی بێهودە دەبێ. هۆکاری ئەوەی زینداینکردنی پیاوە ئاینیەکە یان ئەو کەسەی سەرپەرشتیاری بەستنی گرێبەستەکەیە زیاتر لە سزای کوڕەکە و کچەکە ئەوەیە ئەگەر ئەو کەسانە (جگە لە ڕێپێدراوی قانونیی) ترسیان هەبێ و دڵنیابن لەوەی سزا دەدرێن بەتوندی ئەگەر سەرپێچی قانون بکەن ئەوا خەڵکیش هیچ فێڵێك و ئامرازێکیان لەبەردەست نامێنی تا گرێبەستەکە دوور لە ڕێپێدراو پێکبێنن و ملکەچی قانون دەبن بەناچاری، مەبەستیشمان لە ئامانجی سزادانی کچ و کوڕەکە ئەوەیە کە ئەوانیش بەژداربوونە لەم سەرپێچیە و نەدەبوو پەنابەنە ئەو ڕێگەیە و بەرژەوەندیش لەوەدانیە کوڕەکە کچەکە زۆر بەندکرێن چونکە گرینگەکە لێرە سەرپەرشتیاری بەستنەکەیە.

٣٥- ئەمەمان وەرگرتووە بەشێوەیەکی مەزندەیی لەگەل برگە (٢) ی مادده (٩) لە قانونی باری کەسێتی حالی حازری.

**١-٣-٢- دیدگای قانونی بەراووردکار:**

قانونی دەوڵەتەکان جیاوازیان هەیە لە ڕووی دیاریکردنی تەمەنی هاوسەریی، لەم ڕووەوە قانونی ئیمارات و تونس و ئەڵمانیا و سویسرا و نەمسا و فەرەنسا و هند وەردەگرین.

**١) دیدگای قانونی فەرەنسی:**

لە قانونی فەرەنسی (١٨) ساڵی بۆ کوڕ و (١٥) ساڵی بۆ کچ دیارکراوە بە مەرجی پێکهێنانی گرێبەستی هاوسەریی، تەنها ئەگەر بە ڕێپێدانێکی تایبەت نەبێ لە لای سەرۆك کۆمار[٣٦].

**٢) دیدگای قانونی ئەڵمانی:**

ماددە (٣٠٣) لە قانونی مەدەنی ئەڵمانیدا هاتووە ڕێگە نادرێ بە کوڕێك هاوسەریی پێکبهێنێ پێش گەیشتنی بە (٢١) ساڵی و کچیش بە (١٦) ساڵی، دادگاش دەتوانێ ڕێگە بە ناکامێك (قاصرێك) بدات ئەگەر بەرژەوەندی ئەوی تێدا بوو[٣٧].

**٣) دیدگای قانونی باری کەسێتی ئیماراتی:**

لە بڕگە (١)ی ماددە (٢٠)ی قانونی باری کەسێتی ناوبرا تەمەنی هاوسەریی دیاریکردووە، جیاوازی کردووە لە نێوان تەمەنی کچەکە و کوڕەکە لە کاتی بەستنی گرێبەستی هاوسەریی ئەویش بۆ کوڕ (١٨) ساڵی و بۆ کچ (١٦) ساڵی[٣٨].

٣٦- نفس المصدر.

٣٧- انظر: د.مصطفى السباعي، المصدر السابق، ص ١٢٥.

٣٨- انظر: د.حسام الدين عفانة، المصدر السابق، ص ١.



**٤) دیدگای قانونی تونسی:**

قانونی باری کەسێتی ئەم دەوڵەتەش لە کاتی دیاریکردنی تەمەنی هاوسەریی جیاوازی بەرپاکردووە لە نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ، ئەویش (٢٠) ساڵی بۆ کوڕەکە و (١٧) ساڵی بۆ کچەکە.

**٥) دیدگای قانونی سویسری :**

لە قانونی سویسری کوڕ ناتوانێ گرێبەستی هاوسەریی ببەستێ هەتا نەگاتە (٢٠) ساڵی و کچیش ناتوانێ تا نەگاتە (١٨) ساڵی، لەگەڵ ئەوەش حکومەتی ئەو کانتۆنەی کچ و کوڕەکە تێیدا نیشتەجێن دەتوانێ ڕێگەیان پێبدا بە زەواج ئەگەر:

❶ کوڕەکە گەیشتبێتە (١٨) ساڵی و کچەکەش لە (١٧) ساڵی دەرچوبێت .

❷ پاش ڕەزامەندی وەلییەکان و خزمەکانیان.

❸ ئەمە ئەگەر چەند هۆکارێکی پێویست هەبوو[٣٩].

**٦) دیدگای قانونی نەمسایی:**

لە ماددە یەك ی قانونی نەمسایی دەرچوو لە سالی (١٩٣٨) دا هاتووە کە دەبێ کوڕ تەمەنی (٢١) ساڵی و کچیش بگاتە (١٦) ساڵی تا ڕێگەیان پێ بدرێ هاوسەریی پێکبهێنن، دەکرێ ئەگەر کەسەکە گەیشتبێتە (١٨) ساڵی و سەربەخۆبێت لە دەسەڵاتی دایك و باوکی و وەصایەت هاوسەریی پێکبهێنێ.

**٧) دیدگای قانونی هیندی:**

بە گوێرەی قانونەکانی هیندستان کوڕان لە تەمەنی (٢١) ساڵی ڕێگەی پێکهێنانی هاوسەری پێدەدرێ، هەرچی کچانە لە (١٩) ساڵی ئەم ڕێپێدانەیان دەدرێتێ[٤٠].

٣٩- د.مصطفى السباعي، المصدر السابق، ص ١٢٦.

له قانونی دەولەتەکان ئەوە تێبینی دەکەین جیاوازی کردراوە لە نێوان تەمەنی کچ و کورِ وەك مەرجێك بۆ پێکهێنانی گرێبەستی هاوسەریی، بەلاّم پێشنیاری تەواوکردنی (١٨) سالیمان کرد بۆ هەردوو رەگەز چونکە ئەگەر جیاوازی بکەین لە نێوانیان ئەواپێشێلی مادده (١٤) ی دەستوری عێراقی فیدراڵ (٢٠٠٥)مان کردووە.

٤٠- لەپێناو خۆشەویستیدا، گۆڤاری گولاّن ژمارە (٥٥٧) ساڵی (٢٠٠٥)، ل ٧٦.



# (٢)

# باری ئابووری

## ٢-١- فاكتەری ئابووری:

لایەنی ئابووری و دارایی ئامرازێکە بۆ بەردەوامبوونی ژیان[٤١]، راستە ئامانجێك نیە بەلام مەرجێکە بۆ ژیانکردن. مرۆڤ پێداویستی زۆری هەیە به تایبەت ئێستاکە جۆرەها کەل وپەل و ئامێر و ئامراز هاتۆتە دنیاوە، بۆتە شتێکی حەتمی کە دەبێ مرۆڤ ببێتە خاوەنیان (بۆ نموونە موبایل و ڕۆیشتن لەگەڵ مۆدا.. زۆریتریش.) بوونەتە دروسکردنی ئەرکێکی دارایی و مەحاڵە دەستەبەربوونی.

ئەرکە داراییەکان ئێستا لە سنووری خێزانەکاندا زۆربووە، خێزانیش داهات و خەرجی هەیە، ئەگەر خەرجیەکانی خێزانێك زیاتر بوو لە داهاتی ئەوا ئەو خێزانە کۆتایی پێهاتووە، جا بەویست یان نەویست بێ. لەلایەکی تریش خێزان پێویستی بە پاشەکەوتکردنی پارە هەیە تا بتوانێ ڕووبەڕووی ئەو بارە لەناکاوانە ببێتەوە کە توشی دەبێت یان تا بتوانێ موڵکایەتی ئوتومبیلێك یان شتێکی دیکە بەدەستبهێنێ یان بتوانێ وەك خێزانێکی بەختەوەر گەشت و سەیران بکات.

هەڵوەشانەوەی هاوسەریی زیاتر لەو چینانەیە کە داهاتیان کەمە و باری ئابووریان خراپە، بە تایبەتی لە سەرەتای ژیانی هاوسەریی خێزانەکە[٤٢].

---

٤١- وەکو تێبینیەکی سەیر: بەبیرماندێ لە سالآنی ڕابردوو کاتێ باری ئابووری کۆمەڵگا خراپ بوو و گرانی لە ولآتدابوو چۆلەکەکان ژمارەیان زۆر کەمیکردبوو بەلآم پاشتر ئێستاکە باری ئابووری خەڵکی تا ڕادەیەك باشتربوو ئەوانیش ژمارەیان زیادیکردووە، چونکە بەهۆی گرانی ژیان کۆمەلگا ڕوویکردبووە ئەوان.

٤٢- أنظر: د.بهاءالدین خلیل ترکیة، علم الأجتماع العائلي، ط١، الأهالي للطباعة و النشر و التوزیع، دمشق، ٢٠٠٤، ص١٩٠.

پێویستیەکانی خێزان لە ڕووی دارایی پۆلین دەکەینە دوو بەش:

١. پێویستیە سەرەکیەکان.
٢. پێویستیە لاوەکیەکان.

**پێویستیە سەرەکیەکان:** پێکدێ لە(شوێنی نیشتەجێبوون و خەرجی ڕۆژانە) ئەمەیان ناکرێ خێزان دەستەبەرداری بێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەك و لە بارێکی ئاسایی ژیان بکات و بەردەوام بێت.

**پێویستیە لاوەکیەکان:** (ئوتومبیل، پارەی پاشەکەوتکراو، موبایل، جلی مۆدە، هەڵومەرجی سەردەم...) دەگرێتەوە، ئەگەر خێزانێکی خاوەن قەناعەت بە نموونە بهێنینەوە دەتوانێ بێ ئەو ئامراز و پێداویستیانەبێت. لەگەڵ ئەوەی دەکرێ کەسانێك هەبێ ئەمانەیان لەلا سەرەکی بێت، ئەمەش کاریگەری لەکسە کە دواتر باسی دەکەین[43].

**یەکەم:**

پێویستیە سەرەکیەکان پەیوەندیەکی بەهێزیان هەیە لەگەڵ ڕێژەی تەلاق و جیابوونەوە[44] لە ولاتمان، چونکە زۆربەی ئەو کوڕانەی ژیانی هاوسەریی پێکدەهێنن

---

٤٣- بڕوانە بڕگە (٤)ی ئەم کتێبە.

٤٤- لێکۆلینەوە کۆمەلاٌیەتی و جینائیەکان ئەوەیان سەلماندووە کە شوێنی نیشتەجێبوونی نەگونجاو هۆکارێکی گرنگە بۆ لادانی مرۆڤ (انحراف) و ئەنجامدانی تاوان لە داهاتوودا دەبێتە شتێکی چاوەڕوانکراو و مەترسیەکی کۆمەلایەتی گەورەی هەیە چونکە ئەم هۆکارە پەیوەندیەکی ڕاستەخۆی هەیە بە هەڵسوکەوتی تاوانی مرۆڤ، هەر بۆیە دەولەتەکان گرنگی بە دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوون دەدەن وەك هۆکارێك بۆ ڕێکخستنی هەڵسوکوتی مرۆڤ.

انظر: د. حسنين المحمدى البوادى، الخطر الجنائي و مواجهته، مطبعة عصام جابر، ٢٠٠٣، ص ٣٢٦-٣٢٧.



شوێنی تایبەت بەخۆیان (خانوو، شوقە) نیە، هەرچەندە بەشێکیان تا تەمەنێك ژیانی هاوسەریی بڕیاڕ نادەن لەبەر ئەم هۆیە، پاشانیش چارە نادۆزنەوە، بۆیە پەنادەبەنە بەر ماڵی باوکیان و لەوێ ژوورێك دەکەنە ژینگەی خانەیەکی نوێی کۆمەڵگا، بگرە لەوەش خراپتر کاتێك ماڵی باوکیشیان هەر لەناو کرێ بن.

شایەنی سەرنجە لە کوردستان هەزاران ماڵ دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار خێزان لە یەك خانوو دەژین[45]. لێرەوە کێشەکە دەستپێدەکات کاتێك پێکەوە ژیان دروستدەبێ لەیەك ماڵ، لەسەرەتا گەر بەیەکەوەش بگونجێن بەلاٌم لە ئەنجامی ئەم پێکەوە ژیانە ڕۆژانە ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ڕووداو و وردەکاری ژیان دەبنەوە کە هەموویان کاریگەریان لەسەر یەکتردا هەیە لە داهاتوودا، سات بە سات ئەمانە کەڵەکە دەبن لەسەر یەکتر و بۆ ماوەیەکی کورت بیرۆکەی دژیەك دروست دەبێ لە نێوان کەس و کاری ( دایك و باوك و خوشك و برای) کوڕەکە و هاوسەری کوڕەکە کە لێرەدا کوڕەکەی دەکەوێتە نێوان دوو زریانەوە:

١) ناتوانێ پشتی کەس و کاری بەردا چونکە پەیوەندیەکی سروشتی و کۆمەلایەتی بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە و پێگەی ئەو بوونە و ئەوان گەیاندویانەتە ئەو حاڵەی ئێستا، خۆ ئەگەر وایکرد کەس و کاری حاشای لێدەکەن و دەکەوێتە ژێر لۆمەی کۆمەڵگاوە و چیتر لە ماڵی باوکی جێگای نامێنێ و دەبێ بچێتە خانووی کرێ کە ناتوانێ کرێکەی بدات، لە ئەنجام بەرگەی خەرجیەکان ناگرێ و دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرییەکەی چونکە خۆی لەسەرەتا هەر لەبەر ئەم هۆیە لە ماڵی باوکی دانیشت.

٢) ناتوانێ پشتی هاوسەرەکەی بەردا چونکە ئەو هاوبەشی ژیانێتی و بڕیاری پشگیری و وەفایی پێداوە کاتی بڕیاردانی هاوسەریی، خۆ ئەگەر وایکرد گەر

---

٤٥- بڕوانە: مامۆستامان پ.ی.د.ڕزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣٥.

هاوسەرەکەشی دانبگریٚ تا ماوەیەکە و چیتر بەرگەی ئەم قەیرانە ناگریٚ و دەبێتە فاکتەری شیبوونەوەی خانە نوێیەکە و وازهێنان لە ژیانە نویٚ یەکەی.

کەم هەیە کوڕ پشتی هاوسەرەکەی بگریٚ و ئەو ڕێگە گرانە بگرێتە بەر، لەسەر حاڵی ئەوەی بێبەریبوون لەو پەیوەندیە سروشتیەی بە مالی باوکی دەبەستێتەوە وازهێنانی ئەستەمە، کە لایەکی گرت هیتر ژنەکەی لە پێش چاو دەبەن و دەگاتە بارێك هەستبکا هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردووە کە لەگەڵ کەسێکی ئاوها ژیانی هاوسەریی کردووە و ناتوانیٚ بەردەوام بێت، کاتێکیش دەگەنە بەرامبەر دادگا هیچ ڕێگەیەکی ئەوتۆ نیە تازە بتوانریٚ ئەم زەواجە چارەسەر بکریٚ و هەریەك لە کچ و کوڕەکە بڕیاری جیابوونەوەیان داوە و سوورن لەسەری و یەکتریان لە پێش چاو کەوتووە، زۆربەشیان ئەو زەواجانەن کە کچ و کوڕەکە لە تەمەنێکی بچووك ژیانی هاوسەرییان کردووە.

هەروەك دادوەری باری کەسێتی (ڕەئوف محمد شەریف) لە دادگای باری کەسێتی هەولێر ئاماژەی بەوە کرد کە ئێستا گەورەترین فاکتەری تەلاق و جیابوونەوە نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوونە و ووتی (نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون کوڕەکە ناچار دەکات پاش زەواج لەگەڵ مالّی باوکی دانیشیٚ، لە سەرەتا مەدحی کچەکە دەکەن و بەسەری هەڵدەدەن بەلام کاتێك تێکەڵی لە نێوان کچەکە وە مالّی باوکی کوڕەکە ڕوودەدات و لە ژیانی کۆمەلاّیەتیش هەر گرفت و دڵشکاندن دەبیٚ لە نێوانیان، لە دواییدا مالّی کوڕەکە هاوسەرەکەی لە پێش چاو دەبەن وایان لێدەکەن ڕکیان لە یەکتر بێتەوە و چیتر نەیانەویٚ بەیەکەوە بژین و تەلاّق دەخوازن، کە دێنە پێشمان سوورن لەسەر تەلاق و هیچ چارەیەك نامێنیٚ).

**دووەم:**

پێداویستیە لاوەکیەکانیش گرینگیەکی تایبەتیان هەیە چونکە بەستراون بە خۆشگوزەرانی و بەختەوەری خێزانەوە. ئەو بڕە پارەیەی کە تەرخاندەکریٚ لە سنووری خێزانێکدا بۆ ئەم لایەنە بەستراوە بەو بڕە پارەیەی تەرخاندەکریٚ بۆ پێداویستیە



سەرەکیەکان کە پێشینەترە لەو، لەبەر ئەوەی ئەگەر خێزانێك بۆ نموونە گرفتێکی هەبێت لە دابینکردنی شوێنی دانیشتن ئەوا داهاتەکەی تەنها بەشی پێداویستیە سەرەکیەکانی دەکات و بۆشاییەکی زۆر دروست دەبیٚ لە بودجەی سەبارەت بە پێداویستیە لاوەکیەکانی، زۆرجار بەمە خێزان ڕووبەڕووی جۆرەها گرفت دەبێتەوە کێشەکان گەورە دەبێنەوە دوچاری مەترسی دەبێت.

لە ولاّتی ئێمە هاولاّتیان یان لە (کەرتی تایبەت، کاری سەربەخۆ) یان لە کەرتی گشتی کاردەکەن. لە (کەرتی گشتی) مووچە زۆر کەمە بە شێوەیەك بە تەنها پێداویستیە لاوەکیەکانی بە گران پیٚ دابیندەکریٚ لە کەمی بڕەکەی، جا ئاستەمە یەکێك توانیبێتی پشتی پیٚ ببەستیٚ، گەر وەهاش کرابیٚ ئەوا لەسەرەتای ژیانی هاوسەریی توشی گرانیەکی زۆر دەبنەوە لە بەکرێگرتنی خانوو کە زیاترین بڕی مووچەکەی پیٚ دەڕوا، تا گەنجن چ خۆشگوزەرانیەك لە ژیانی هاوسەریی نابینن، جا ئەگەر زۆر خۆڕاگربن و هۆکارە دەرەکیەکان کاریگەریان تێنەکان ئەوا بەرگەدەگرن ئەگەر نا لەم حالّەتە بە هەلّوەشانەوە کۆتایی دێت گەر خاوەن قەناعەت نەبن، ئەمە خالّێك❶.

(کەرتی تایبەتیش) لە کوردستان ڕۆڵێکی بەرچاوی نیە لە دابینکردنی هەلی کار و شایەنی باس نین. ئەوەی دەمێنیٚ ئەوانەن کاری سەربەخۆ دەکەن کە بڕێکیان لەوانەن خوێندنیان تەواو نەکردووە و بڕێکیشیان خوێندنیان تەواو کردووە تەنانەت زانکۆشیان تەواو کردووە، لەبەر کەمی مووچە ڕوویان لە کاری سەربەخۆ کردووە، لەم ڕووەش بنکەیەکی ڕیٚ نیشاندەر نیە کار بۆ هاولاّتیان بدۆزیٚ و داراییەکی هەبیٚ هەلی کار دروست بکات لە پرۆژەکان، بۆیە کەم کەس هەیە کاری وەهای دەست کەویٚ لە سەرەتای ژیانی هاوسەریی پێداویستیە سەرەکی و لاوەکیەکانی بۆ دابین بکات.ئەمەش خالّێکی تر❷.

لە نێوان ئەم دوو پارچەیەی پێشوو و دەست نەکەوتنی داهاتی پێویست کۆمەلّگا ڕووەو (دوو کاری) چووە لە ویستدا، واتا ئەوەی بۆی دەڕەخسێت دوو کار دەکات و

بگرە زیاتریش لەم بڕە هەیە و زۆرینەی کاتەکان بۆ کارکردن تەرخان دەکرێت، "کاتی خێزانی" ئەو هۆیەی بەردەوامبوونی خێزانی لێدەکەوێتەوە بەشی نامینێ و تەنها ڕاکەڕاکە بەدوای داهاتێکی گونجاوە. لەوانەیە لێرەدا هەندێ لەو خێزانانە داهاتێکی گۆنجاویان دەستکەوێ بەلاٚم گرفتەکە دەکەوێتە سەر کات چونکە ئەو خێزانەی پیاوەکە یان پیاو و ئافرەتەکە لە بەیانی زووەوە تا کاتێکی درەنگ لە کار دەبن ناتوانن کاتێك تەرخان بکەن بۆ ژیانی هاوسەریی، خۆ ئەگەر منداڵیان ببێت دیسانەوە گرفتێکی دیکە پەیدا دەبێ لەوەی کێ گرنگی پێ دەدات؟ چۆن؟ کەی؟ منداڵەکە چۆن دەردەچێ؟..و زۆریتر، ئەم گێژاوەیەش زۆر گرفتی لێدەبیتەوە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، ئەمەش خاڵێکی تر❸.

لەو سێ خاڵەی ڕابردوو ئەگەری درووستبوونی زۆری هەلوەشانەوەی هاوسەریی لێدەکەوێتەوە. بێگومان لەگەڵ کۆمەڵێك فاکتەری ترەوە چونکە مرۆڤ لە ڕێگای بۆ سەرکەوتنی هاوسەرییەکەی توشی کۆمەڵی کۆت دەبێ و تەنها بە هەوڵ و تەقەلاٚی خۆی نەبەستراوەتەوە لە هەموو بارەکاندا، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بتوانێ لە کۆتە دەروونیەکانی ڕزگاری بێت لە ڕووی داراییەوە بۆ خۆی گوێ نەدا و چاوپۆشی لێبکات، کۆتە کۆمەلاٚیەتیەکان ڕێگەی لێدەگرن و گرانیەکی زۆری دیکەی لەسەر دادەبەزێنن[٤٦].

داواکاری گشتی (ئاریان نورەدین) لە دادگای باری کەسێتی بەپێی لێکدانەوە و شارەزایی لە داواکانی تەلاق ووتی: ٨٠٪ جیابوونەوەکانی ئێستا هۆیەکەی لایەنی داراییە و تێکەڵ بەمەش بچووکی تەمەن کاتی پێکهێنانی ژیانی هاوسەریی.

46 بڕوانە: د.علی وردی، کارە نائاساییەکانی نەست یان نهێنی کەسێتی سەرکەوتوو، وەرگێڕانی: بەرزان ئەحمەد، چاپی دووەم، خانەی چاپ و بلاٚوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٢٢.



## ٢-٢- چارەی ئەم کێشەیە:

کێشەی هەرە گەورەی خێزان یان ئەو کەسەی بیر لە پێکهێنانی خێزان دەکاتەوە نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون و داهاتی گونجاوە، کە دابینکردنیان مافێکی دەستووریی هاولاٚتیانە و دەوڵەت دەیگرێتە ئەستۆ، ئاماژەی پێکراوە لە ماددە (٣٠) بڕگەی یەکەم:

"دەولەت چاودێری کۆمەلاٚیەتی و تەندروستی دابین دەکات بۆ تاك و خێزان - بەتایبەت منداڵ و ئافرەت - لەگەڵ بنەما سەرەکیەکانی ژیانێکی ئاسوودە، کە داهاتێکی گونجاو و شوێنی نیشتەجێی ئارامیان بۆ مسۆگەر بکات"[٤٧].

هەمووومان دەزانین دەستووری عێراقی فیدرال لەسەر هەرێمی کوردستان جێبەجێ دەبێ و کاتێك دەستووری تایبەت بە هەرێمی کوردستانی فیدرال دادەنرێ دەبێ ئەویش ملکەچی ئەو دەستوورە بێت[٤٨]. لە راستیدا کوردستان لەم بارەی ئێستا گونجاوتر نابینێتەوە و هیچ بیانۆیەك لە ئارادا نەماوە تا ئەم ماددەیە جێبەجێ نەکرێ و تازووە پێویستە بەدواداچوونی بۆ بکرێ.

لە لایەکی دیکەوە لە مادده (١١) ی دەستووری فیدراڵی دا هاتووە "نەوت و غاز موڵکی سەرجەم خەڵکی عێراقە لە هەموو هەرێم و پارێزگاکاندا" ئەمەش ئەو مافەی پێشتر باسمانکرد دوو ئەوەندە پتەوتر دەکات، کەواتە ئێمە هەر هەمووومان بەشی تایبەت بە خۆمان هەیە لەو سامانە نەوتیە مەزنەی ولاتەکەمان و لەوەش پێشینەتر نی یە کە بەکاربهێنرێ تا بێ شوێن نەبێن و داهاتێکی گونجاومان هەبێ.

٤٧- دەستووری عێراق فیدرال (٢٠٠٥)، دەقەکەش بە زمانی عەرەبی "تكفل الدولة للفرد و الاسرة- و بخاصة الطفل و المراة —الضمان الاجتماعي و الصحي، و المقومات الاساسية للعيش في حياة حرة كريمة، تؤمن لهم الدخل المناسب، و السكن الملائم".

٤٨- بڕوانە :مادده (١٣) ی دەستوری عێراقی فیدرال (٢٠٠٥).

**لە کێشەی یەکەم (شوێنی نیشتەجێبوون):**

بیرۆکەیەکی زیرەك نی یە ئەگەر بوترێ زەوی دابەشبکرێ بەسەر ئەو خێزانانەی بێ شوێنن یان ئەوانەی دەیانەوێ خێزان پێکبهێنن، لە راستیدا بەم شێوەیە هیچمان نەکردووە چونکە دەیان کێشەی لەدوایە تا بتوانرێ خانووی نیشتەجێبوونی لەسەر بکرێ. هەروەها هەمدیس لەم قۆناغەی ئێستامان کارێکی ئاسان نی یە دروستکردنی خانووی تایبەت بۆ ئەوان، و لە لایەکی دیکەش چاتر وایە شار بەرەو ئاسمان گەشە بکات نەك بەشێوەی ئاسۆیی، بۆیە هەر خێزانێك شوێنی نی یە یان ئەو کچ و کورەی تازە دەیانەوێ بچنە ژیانی هاوسەرگیری و جێگەیان نی یە، دەولەت هەڵدەستێ بە **دروستکردنی ئەپارتمانی**[49] **گونجاو** و رێك و خاوەن هەلومەرجێك ژیان بەرێکی تێیدا بەرێوەچێ، ئەمەش دەدرێت بەرامبەر کۆمەلە مەرج و رێکخستنێ و بەقانونێك کە لە برگەی داهاتوو باسیدەکەین.

**کێشەی دووەم: ( داهاتی گونجاو):**

ئەمە دوو روو دەگرێتەوە:

١) **ئەو کەسانەی دەتوانن کاربکەن**[50]: لە حالی ئیستامان هەزاران گەنج لە زانکۆکانی کوردستان سالانە خوێندن تەواو دەکەن، سەرەرای ئەوەی هەرە زۆریان لەو بوارە ناخوێنن کە ئارەزوویان لێ یە، ئینجا پاش دەرچوونیان لەو بوارەش بۆیان نارەخسێ کاربکەن کە پسپۆرێتیان لێ وەرگرتووە ئەگەر بۆیان برەخسێ و دەرفەتی دامەزراندیان بدەنێ.

لە لایەکەوە رێگەیاندەدەن کە بخوێنن لە لایەکی دیکە فکر لە دەرکردنی ئەوانەش دەکەنەوە کە دامەزراون، بەلام لێرە دەرفەت نی یە باس لە حالەتی وەزیفە گشتیەکان

٤٩- شُقة (شوققة).

٥- ماددە (٢٢) ی دەستووری عێراقی فیدرال: (یەکەم: کارکردن مافی هەموو عێراقیەکانە بە جۆرێك کە ژیانێکی ئاسوودەیان بۆ مسۆگەر بکات).



بکەین لە کوردستان[51] بە دووروودرێژی، لەگەل ئەو حالەش وەکو باسمانکرد مووچەکەشی یەکجار کەمە. ئەگەریش ئەم حالەیان پێ چاکناکرێ بەم زووانە بۆ دابینکردنی هەلێکی کاری گونجاو ئەوا پەنا دەبەینە رێگەیەکی دیکە کە **دروستکردنی** هەلی کارە. بەپێ ی ماددە (٢٦)ی دەستووری فیدرال: "دەولەت هاندانی وەبەرهێنان لە ئەستۆ دەگرێت لە بوارە جیاجیاکاندا..." و بەو بودجە و سامانەی کە مولکی هەموو خەلکە بەیەکسانی (مەبەست لە سامانی نەوت و غازە)، کەواتە پرۆژەی جۆراوجۆر لە ولاتەکەمان کوردستان دادەمەزرێنرێ و هەتا ئەگەر کۆمپانیایەکی بیانی پرۆژەیەکی وەبەرهێنان یان هەر بوارێکی دیکە لە کوردستان دامەزراند ئەوا لەگەل گرێبەستەکەی مەرجی بەکارخستنی هاولاتیانی کوردستانی بۆ دادەنرێ جا بە گشتی یان رێژەیەکی دیارکراو، ئەگەریش گرفتی ئەوە هەیە کرێکارەکانی کوردستان شارەزاییان نیە لەو کارە ئەوا خولی راهێنانیان بۆ بکەنەوە، پاشانیش ئەم هەلانە بەیەکسانی[52] و بەپێی مەرجە زانستی و قانونییەکان دەدرێت بە هاولاتی و داهاتێکی گونجاوی بۆ دادەنرێ. خۆ ئەگەر نەتوانرا کار بۆ داواکار دابین بکرێ ئەوا بۆ ماوەیەکی کاتی مووچەی دەدرێتێ تا کاری بۆ دابین دەکرێ.

٢) **ئەو کەسانەی ناتوانن کاربکەن**[53]: ئەو کەسەی لە توانایدا نیە جا لەبەر ئەوەی نەخۆشیەکی کوشندەی هەیە یان پەکیکەوتووە یان بەسالاچووە یان لەبەر هەر هۆیەك بێت و نەتوانێ کاربکات ئەوا داهاتێکی گونجاوە پێدەدرێ کە لەگەل باری کۆمەلایەتی و تەندروستی و ئەرکە داراییەکانی و...هیتر بگونجێ.

٥١- بۆ زانیاری لەم بوارە بروانە: مامۆستامان پ.ی.د. رزگار محمد قادر، لەپێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩٩.

٥٢- بروانە ماددە (١٦) دەستووری فیدرالی .

٥٣- ماددە (٢٩) برگە یەکەم (أ) لە دەستوری عێراقی فیدرال(٢٠٠٥).

## ٣-٢- ڕۆڵی قانون:

پێویست وادەکات چەند قانونێکی نوێ دانرێ و چەند شکلیەتێك و ڕێکخستنێکی تێدا بکرێ:

**یەکەم: قانونی دابەشکردنی ئەپارتمان:**

ئەو ئەپارتمانانەی دروست دەکرێن،چۆنە؟ فراوانی و ڕووبەرەکەی چەندە؟ چەند نهۆمە؟ چی تێدایە؟ لە کوێیە؟ هەلومەرجەکانی چین؟.. و چەند شتێکی دیکەی لەم بارە و پاشان کێ وەریدەگرێ؟ چۆن وەریدەگرێ؟ کەی وەریدەگرێ؟ چۆن دابەش دەکرێ؟ پاشان مافەکانی خاوەنەکەی بەسەر ئەپارتمانەکە و پەیوەندیەکەیان؟ هەروەها چۆن و کەی و بەهۆی چی لێی وەردەگیرێتەوە؟ هەروەها گرفتەکانی دیکەش لە ناو ئەم قانونە ڕێکدەخرێ لەگەل سزاکانی خراپ بەکارهێنانی.

مەرجە سەرەکیەکانی وەرگرتنی ئەپارتمان ئەمانەن:

١) دەبێ داواکار ژیانی هاوسەریی پێکهێنابێ و لەناو ژیانی هاوسەریی بێت یان مامەڵەی بۆ کردبێ.

٢) نابێ داواکار یان هاوسەرەکەی خاوەن خانوو یان زەوی بن، بۆ ئەمەش داواکار پشتگیریەك لە فەرمانگەی تۆمارکردنی خانووبەرە دەهێنێت کە ئەمە دووپات دەکاتەوە.

مەرجە سەرەکیەکانی ئەپارتمان ئەمانەن:

١) دەبێ خودی داواکار و هاوسەرەکەی نیشتەجێی ئەو ئەپارتمانە بن.

٢) بە هیچ شێوەیەك بەموڵك ناكرێ یان بەموڵك دەکرێ بەلاّم ناتوانرێ بفرۆشرێ.

٣) تەنها مافی بەکارهێنانی دەبێ و ناتوانێ بەکرێی بدات یان بیفرۆشێ.



مەرجە سەرەکیەکانی وەرگرتنەوەی ئەپارتمان (لێسەندنەوە):

١) ئەگەر خودی داواکار و هاوسەرەکەی نیشتەجێی ئەو ئەپارتمانە نەبوون و پاش ئاگادار کردنەوە.

٢) داواکار نیشتەجێ ی نەبوو لە دوای مانگێك لە وەرگرتنی.

٣) بە بەجێهێشتنی ئەپارتمانەکە:

❶ بە وەرگرتنی مۆڵەت لە چاودێری بالاّخانەکەی، بەلام تا ماوەی ساڵێك نەگەرایەوە. ئەگەریش چووبووە دەرەوەی عێراق بۆ خوێندن ئەوا بە قانونەکە مۆڵەتێکی دەدرێتێ بەڕادەی ئەو ماوەیەی خوێندنەکەی تەواو دەبێ.

❷ بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت: پاش (٣٠) رۆژ لە جێهێشتنی لێ ی وەردەگیرێتەوە، مەگەر بە هێزێکی لەدەرەوەی دەستەلاّتی ئەو بێت.

❸ بە وەرگرتنی تەلاق یان جیابوونەوەی پیاو و ئافرەتەکە ئەگەر منداڵیان نەبوو تێیدا نیشتەجێ بێت.

جگە لەمانە قانونەکە ستاندەرێ بۆ ئەپارتمانەکان دادەنێ بەشێوەیەك ژیانێکی ئاسوودە و بێ سەرئێشەی تێدا بەسەر ببرێ. ئەگەر ئەپارتمان لە یەکێك وەرگیرایەوە لە ئەنجامی پێشێلکردنی ئەم قانونە ئەوا جارێکیتر نایدرێتەوە ئەم بریارەش لەلایەن دادگا دەردەچێ. ڕێنمایی قانونیی بەکارهێنانی ئەپارتمان لەگەل وەرگرتنەکەی دەدرێتە داواکار و بەرپرس دەبێ لەسەری و لەمەش ئاگادار دەکرێتەوە.

**دووەم : قانونی ڕێکخستنی داهات:**

ئەم قانونە هەڵدەستێ بە ڕێکخستن و دانانی نزمترین ئاستی داهات کە تاکێکی پێگەیشتوو ناکرێ لەوە کەمتر وەرگرێ لە کارکردن و دیاریکردنی ئەو داهاتەی کە تاکێکی لەکارکەوتوو (ئەو تاکەی نەتوانراوە تا ئەو کات کاری بۆ بدۆزرێ) یان تاکێکی پەککەوتە وەریدەگرێ لەگەڵ مەرجەکانی و دیاریکردنی شکلیەتەکەی و لایەنە پەیوەندیدارەکانی و شتی دیکەش.

ئەم قانونە هەلدەستێ بە دامەزراندنی بنکەیەك، کە پێ ی دەوترێ (**بنکەی دۆزینەوەی کار**) کە خاوەن میکانیزم و هەڵومەرجێکی چالاکە. هەڵدەستێ بە دارێژانی پلانی ئابووری و دابینکردنی پرۆژە بە هەموو جۆرەکانی و دروستکردنی هەلی کاری جۆراوجۆر و بانگێشکردنی هاولاتیان بۆ ئەو کارانە. هەڵدەستێ بە رەچاوکردنی مەرجە قانونیی و زانستیەکان لە داواکاری کار بەپێی ئەم قانونە. ئەگەر کەسێك داوای کارکردنی کرد و کار لە پسپۆریەتی ئەودا نەدۆزرایەوە لەو کاتە ئەوا بۆ ماوەیەکی کاتی مووچەیەکی گونجاوی پێدەدرێ زۆر کەمتر نەبێ لەو مووچەیەی لە کارەکەی خۆی بەدەستی دێنێ ئەمەش بە پشتبەستن بە ماددەی (٢٢) بڕگە (١) لە دەستووری عێراقی فیدرال.

ئەم بنکەیە یەکەیەکی پزیشکی هەیە تایبەتە بە پشکنینی ئەو کەسانەی لە توانایان نی یە هیچ جۆرە کارێك بکەن و پەکیان کەوتووە، لە کاتێ ئەمەیان بۆ سەلما داهاتێکی گونجاوی بەپێی ئەم قانونە بۆی دابین دەکرێ.

لە لایەکی دیکەوە جگە لە بابەتەکانی پێشوو پێویستە مامەڵەیەکی زیرەکانە بکرێ لەگەل ئەگەری مانەوەی دوو هاوسەرەکە بەیەکەوە، رێگەیەك بدۆزرێتەوە کە هانی کچ و کورەکە بدات تەمەنی خۆیان بۆ ئەو هاوسەرییە تەرخان بکەن. لە توێژینەوەیەکی سالآنە لە بەریتانیا کە ئامادە کراوە لە لایەن راوێژکارە کارگێریەکانی (گرانت سۆرنتن) دووپاتکراوەتەوە ئەگەر پەیوەندیەکی هاوسەریی لە (٢٠) ساڵ زیاتر بەردەوام بوو ئەوا ئەستەمە بە تەلاق کۆتایی بێت[٥٤]. بۆیە پێویستە پاداشتێکی مەزنی ئەو هاوسەرییانە بکرێ کە تەمەنیان دەگاتە (٢٠) ساڵ، ئەم پاداشتە بەپێ ی باری ئابووری ئەو کاتی ولآت دیاردەکرێ کە پێشکەشدەکرێ و بۆ ئەوەی ئەم خالە مەبەستەکەی بێنێتە دی دەبێ بەڕاستی بڕە دراوێکی هاندەربێت. قانون دانەریش ئەمە دەکاتە نێو قانونی باری کەسێتی.

54- See: Divorce, From Wikipedia the Free encyclopedia P6. available on: <http://en.wikipedia.org>.



# (٣)

# رۆڵی لەکس

### ٣-١- رۆڵی لەکس و هەلومەرجی سەردەم:

لەکس[٥٥] بەواتا (خۆڕازاندنەوە،تجمل) دێت، ئەم بابەتە زۆر کەم باسکراوە، بەلاّم خاوەن کاریگەریەکی مەزنە لەسەر سەراتاپای باسەکانی دنیا، تابلێی ئیستا بووە بەپێوەرێك بۆ هەر بابەتێك ئەگەر ویستی سەرکەوتنی بۆ خوازرابوو. لەکس هەر شتێکە چێژی جیاکاری بداتە مرۆڤ.

مۆنتسکیۆ دەڵێ لەکس لە ئەنجامی نایەکسانی لە دابەشکردنی ماڵ و دارایی ناو دەولەت سەرهەڵدەدات[٥٦].

---

٥٥- لەکس لە قورئانی پیرۆز بە ڕاستەوخۆیی ئاماژەی پێنەکراوە بەلاّم باسی لێوەکراوە بە ووتەی (قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ)(سورة التوبة ٢٤)

هەروەها (زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ، قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ)( سورة آل عمران ١٤-١٥)

و (اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرّاً ثُمَّ يَكُونُ حُطَاماً وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ، سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاء وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ) (سورة الحديد ٢٠-٢١).

٥٦- مۆنتسکیۆ، ڕوحی یاساکان، وەرگێڕانی: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٧٥ .

ئەم نایەکسانیە لە دابەشکردنی ماڵ و دارایی لە هەر وڵاتێکدا گەلێك هۆکاری ئاڵۆز دروستی دەکات لە نێوان تاکەکان و دەوڵەت .

بەپێ ی بیروڕای مۆنتسکیۆ لەکس لەلای ئەو کەسانەی تەنیا داراییان بەشی پێداویستیەکانی ژیانیان دەکات یەکسانە بە سفر، بەلاّم ئێمە لەو باوەڕەداین لەم سەردەمە هەندێ لایەنی لەکس پێشینەترن لە هەندێ پێداویستی و مرۆڤەکان ناچار دەبن پەنای بۆ ببەن، بۆیە کەم کەس لەم سەردەمە ڕێژەی لەکس لەلای یەکسانەبێ بە سفر .

ئەو هۆکارانەی دەبنە سەرچاوەی سەرهەڵدانی لەکس:

١) نایەکسانی دارایی کەسەکان لە وڵات و دەوڵەمەندی وڵات.

٢) مەزنی شارەکان و زۆری ژمارەی دانیشتوان، بە تایبەتی پایتەخت.

٣) سروشتی مرۆڤ لە ڕووی ئەنانیەت و ویستی ڕاکیشانی سەرنجی گشتی و خۆ دەرخستن سەروو لە چینی خود.[٥٧]

ئەو سروشتەی مرۆڤ، پێویستی بە فاکتەری دیکە هەیە تا بە جۆشەوە دەرکەوێ. کاتێك ژمارەی دانیشتوانی شوێنێك زۆردەبێ ئەوا خۆبەزلزانی و سەرەڕۆیی مرۆڤ زیاتر دەبێ و زیاتر هەوڵی خۆ دەرخستن دەدا بە هەر هۆو فاکتەر و کارێك بێت هەتا بە بچووکترین شتیش بێت، بۆ ئەوەی سەرنجی رای گشتی بۆ لای خۆی راکێشێ. خۆ ئەگەر ژمارەی کەسەکانی یەك شوێن بە ڕادەیەك زۆربوو کە کەس کەسی نەدەناسی ئەوە ئارەزووی دیاربوون و ئەنانیەت زیاد پەرەدەسێنێ چونکە دەرفەتی سەرکەوتن لەو جۆرە کۆمەڵگایانە زۆرترە و لەکس ئەم دەرفەتە زیاتر دەکات، لەگەڵ ئەوەش تاکەکان هەردەم لە هەوڵی ئەوەدان ژیانی خۆیان بەشێوەیەك ڕێکبخەن کە وەکو چینەکانی سەرووتری خۆیان بێ، کەچی دەرئەنجامی پێچەوانەیان دەستدەکەوێ چونکە هەر کەس لە شوێنی خۆیەوە هەوڵدەدا لە خەلك جیاوازبێ ئەمە وەك مەیلێکی گشتی لێدێت و لە ئاکامدا هەموویان یەکسان دەبن، هیچ کەس لە سەرووی کەسێکی دیکەوە دیارنابێت لەبەر ئەوەی هەرکەس دەیەوێ سەرنجی گشتی بۆ لای خۆی

٥٧- مۆنتسکیۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦.



راکێشێ، لە ئەنجامیشدا کەس سەرنجی کەس نادا، ئەم بارۆخەش جۆرە نارەحەتی و ئازارێکی گشتی بەرهەمدێنێ[٥٨] .

خەڵکی کوردستان ئەوەندە ڕەشبینی و ناخۆشی و نەگبەتی و قڕانی بەسەرهات و ئەو بارودۆخە گرانەی پێی تێپەربوو کۆمەڵگای کوردی توشی رەشبینی درێژخایەن کرد، باری وەها بەسەر کۆمەڵگامان هات خەڵك ڕازی بوو بەوەی بەس لە ژیان بمێنێتەوە و ئەمە گەورەترین دەستکەوت بوو لە لای، قالب و بنەماکانی دڵخۆشی گشتی[٥٩] لە ناوچوو و دڵخۆشی گشتی نزیکە سفر بوو. جا ئەو کارەساتەی کە گیرۆدەی بووین زۆر ڕوون و ئاشکرایە، شوێنەوارەکانیشی ئەگەر لە ڕووی مادییەوە ئیستا کەم بووبێتەوە لە رووی مەعنەوی(واتایی) و دەروونی تا ئەوەکانی داهاتووش هەر کاریگەری دەبێت. خەڵکی زۆر ماندوو ببوو کە لە ئەنجامی بێزاری و تورەییەوە پەیدا دەبێ[٦٠] و ناچاریش بوون بیدەنگبن چونکە لەم حالەتانە دانیاننابوو ئەمە حاڵیانە و زانیبوویان هیچ چارەیەك نی یە جگە لە قایلبوون[٦١].

پاش رزگاربوونی عێراقیش لە دەست دکتاتۆریەت، سەرتاپای بوارەکان گۆرانکاریەکی خێرای بەخۆوە بینی، لە سیستەمێکی دکتاتۆریەت یەکسەر چوینە سەر دیموکراتیەت (لە عێراق بە گشتی). مامەڵەی نێودەوڵەتی فرەلایەن لەگەڵ عێراق کرایەوە، باری ئابووری هاولاتیان ڕووەو زیادبوون چوو، بەگشتی جیهانمان بۆ کرایەوە و بەجۆرەها ئامرازی گواستنەوە و گەیاندن بە جیهانی دەرەوە ئاشنابووین کە تاڕادەیەك پێشتر لێ ی دابرابووین.

٥٨- مۆنتسکیو، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦

59- General happiness.

٦٠- دیل کارنگی، دوودڵی و زاڵبوون بەسەر نیگەرانی دا، وەرگێرانی: شەریف حەمە رەشید، چاپی دووەم، نێوەندی بلاوکراوەی ئارام، بەبێ ساڵی چاپ، ل ٤٤٤.

٦١- دیل کارنگی، دوودڵی و زاڵبوون بەسەر نیگەرانی دا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٥.

ئەم گۆڕانە خێرایەی بەسەرمان روویدا رووداوێکی خاوەن کاریگەری نامۆیە چونکە لەبارێکی ئاساییدا هەنگاو هەنگاو ئەم رووداوانە روودەدات. کاتێکیش وەهامان بەسەرهات هەر تاکەو وێلبوو بە دوای بەختەوەری خۆی و بەیەکجاری کۆمەڵگا رووەو لەکس و چێژی ژیان و جوانکاری کەوت بە جۆرەهای، بەشێوەیەك خەڵکی خۆیان بە لەکس گرتووە کە زۆربەی هەموو هەوڵێك دەدات بۆ دەستکەوتنی خاڵێکی تر جیای بکاتەوە لە دەورووپشتەکەی. هەروەك مۆنتسکیۆ دەڵێ "لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا کە هەرکەس لە شوێنی خۆیەوە زۆر بەخێرایی بەرەو هەواو هەوەسەکانی خۆی هەنگاو دەنێ ئاشکرایە فەزیلەتی نەتەوەیی چەندە زوو لەناو دەچێ"[٦٢] و خەڵکی خەریکە ئاگای لە رووداو و باری ولاّت و بەرژەوەندی گشتی ... بە تەواوی نەمێنێ و گرینگی بە کۆمەڵێ شتی بێ نرخ و بێ بەها بدات.

بەم شێوەیە کوردستان رووەو لەکس چووە و لەمەشدا روو لە زیادبوونە.

پێمان وایە لەکس لەرووی کاریگەرییەوە دوو جۆرە:

١) لەکسی دروستکەری فشاری دارایی لەسەر کەسەکە.

٢) لەکسی دروستکەری فشاری دەروونی لەسەر کەسەکە.

**یەکەم: لەکسی دروستکەری فشاری دارایی لەسەر کەسەکە:**

ئاشکرایە ئەگەر لەکس لە ولاّتێکدا بلاّوبۆوە ئەوا پێوەرێك پەیدا دەبێ بۆ نزمترین ئاستی لەکسی بەدیکراو لە تاکەکان و هەلومەرجەکانیان، کە ناتوانرێ ئەو ئاستە بەهەند وەرنەگیرێ، مەگەر بە ئەستەم نەبێ لای ئەو کەسانەی بە ناتەواوی ئەقلی دادەنرێن. جا ئەمە دەبێتە هۆی دروستکردنی ئەرکێکی دارایی لەسەر خێزان و گرانیەك لەبەدیکردنی ئەو ئاستە، جا چی ئەگەر پیاوەکە یان بەشێوەیەکی تایبەتتر ئافرەتەکە داواکاریەکانی زۆربێت، ئەوا خێزانەکە خۆی ناگرێت و تووشی هەلوەشانەوە

٦٢- مۆنتسکیۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٨.



دێت گەر لە رووداوەکانی کۆمەڵگا بکۆڵینەوە، هەروەك دادوەری باری کەسێتی هەولێر (رەئوف مەحەمەد شەریف) ووتی:"ئافرەت لە سەرەتای هاوسەریی لەوانەیە داوای هیچ نەکات کەچی دواتر داوای هەموو شتێك دەکات، چونکە دەبینی فلان ئەو ئوتومبیلەی هەیە و فلان خانوویەکی وەهای هەیە و ...هیتر، پیاوەکەش توانای ئەو ئەرکە داراییە قورسەی نابێ، بەم شێوەیە چیتر لەگەڵ یەکتر رێکناکەون".

**دووەم: لەکسی دروستکەری فشاری دەروونی لەسەر کەسەکە:**

ئەم جۆرە لەکسە زیاتر لە ئەنجامی کاریگەری ئەو لەکسە نی یە کە کەسەکە خۆی بەکاریدەهێنێ، بەڵکو کاریگەری ئەو لەکس و هەلومەرجەیە کە کەسەکانی دیکە بەکاریدەهێنن و هەیانە، چونکە لەکس دەبێتە هۆی بلاوبوونەوەی گەندەڵی ڕەوشتیی (فەسادی ئەخلاقیی) (بۆ نموونە دەبینین هەندێك لە رەگەزی مێینەی ولاتەکەمان ئیستا زۆربەیان چ گۆڕانکاریەك بە مەبەستی لەکس (جوانکاریی) بەسەریان هاتووە کە بۆتە بلاوبوونەوەی فەسادی ئەخلاقیی) کە دەبێتە هۆی پێکهێنانی ژینگەیەك تیایدا گرینگی بە شتی بێ بەها و کەم نرخ بدرێ و شتەگەورەکان بەکەم بگرن[٦٣].
کاتێکیش کۆمەڵگایەك بەو شێوەیە بژێ بەرەبەرە ئەو هەست و سۆزو خۆشەویستیەی لە ژیانی هاوسەرییدا هەیە گوێ ی پێ نادرێ هەروەك ئەوەی لە یۆنانی دێریندا روویدا[٦٤].

هەروەها لەکس کاریگەری و پەیوەندیەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ قەناعەت، جا لەو ولاّتەی لەکس بلاوبێتەوە ئەوا خەڵکەکەی خاوەن قەناعەتێکی کەم دەبن و زۆرجار ناتوانرێ رازی بکرێن. ئەم کاریگەریەش لەناو خێزان رۆڵێکی بەهێزی هەیە چ لەڕووی پیاو و ئافرەتەکە بەگشتی و چ لەڕووی هەریەکەیان بە تایبەتی. ئەویش بەشێوەیەکی

٦٣- مۆنتسکیۆ، سەرجاوەی پێشوو، ل ١٨٤.

٦٤- مۆنتسکیۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٥.

گشتی زۆرجار خودی پیاوەکە یان ئافرەتەکە وەك لەکسێك بەکاردەهێنرێ لە لایەن هاوسەرەکەی جا چ بەهۆی جوانیەکەی، پارە،پلەوپایەکەی بێت.

لە ڕووی ئافرەتەکە: بەو پێ یەی دەوروبەرەکەی دەبینێ قەناعەت گران دەبێ بۆ ئەو خانووە یان ئەو شوێنە نیشتەجێبوونەی مێردەکەی بۆی کردووە یان ئەو ئۆتومبیلەی هەیەتی یان ئەو جل و بەرگەی ئافرەتەکە لەبەریدەکات...هیتر، بۆیە دەبینین ئافرەت هەیە چەندەها جار خانوویەکی نوێ بە پیاوەکەی دروست دەکاتەوە، ڕۆژانە نابێ جلەکانی دووبارەبێتەوە.. .

یان لە ڕووی پیاوەکە: ئەو لەکسەی لەلایەن ئافرەتانی دەرەوە (چ لە ناو شار چ لە تەلەفزیۆن...) بەکاردەهێنرێ لە جل و بەرگ و هەڵومەرجەکانیان کاریگەریەکی زۆری دەبێ لەسەر قەناعەتی پیاوەکە، بۆیە دەبینین پیاو قەناعەتی بە هاوسەرەکەی نایات یان موڵك و سامانی هاوەڵەکانی تامەزرۆی ئەوەی دەکەن هەر ڕێگەیەك بگرێتەبەر تا لە ئاستی لەکسی ئەوان بژێ...هیتر.

کاریگەری ئەو دووجۆرە لەکسەی باسمانکرد دەبێتە فاکتەرێکی گرینگی هەڵوەشانەوەی خێزان و بەرزکردنەوەی ڕێژەی تەلاقە لە ئەنجامی ئەو شوێنەوارە خراپانەی لێی دەکەوێتەوە.



### ٣-٢- ئەو ڕووەی پێویستی بە چارەسەرە:

چارەسەر ئەوە نیە چیتر نەهێڵدرێ هەلومەرجێکی لەکس بەکاربهێنرێ لە ولاتمان یان خەڵکی وا تێبگەیەنین دژی لەکس بن، چونکە ئەمە بوارێك نیە بە هۆی ئەم کارانەوە کاردانەوەیەکی هەبێ. هەروەکو پێشتر باسمانکرد لەکس بەهۆی نایەکسانی دابەشکردنی سەروەت و سامان سەرهەڵدەدا و مرۆڤەکان لەڕووی دارایی لە یەکتر جیاواز دەکات، لەمەوە جۆرە بەربەرەکانی و ڕکابەرایەتیەك لە نێوانیان سەرهەڵدەدات و جۆرە دوژمنایەتیەکی تایبەت پەیدا دەبێ، هەریەك لە ڕاستی خۆی دەیەوێ خۆی بە باشتر و سەرکەوتووتر بەدەربخات، زۆر جاریش تانە و ڕەخنە لە کەسانی دەوروبەری دەگرێ هەر لەم پێناوە، لێرە لەکس کاریگەرە خراپەکانی دەردەکەوێ.

زۆر لە زانایان و هزرمەندان پێیان وایە دوو هێزی دژیەك لە ناخی مرۆڤ هەیە[٦٥]، یەکێك باش و یەکێك خراپ. ئێمەش پێمان وایە مرۆڤ لەم ڕووەوە لە نێوان دوو لایەن وەستاوە، یەکەمی **سادەییە** کە لە سروشتدا مرۆڤ بەم هەستە هێمن و ئاسودە دەبێ، لە بەرامبەریش لایەنی دووەم **خۆبەزلزانی** و **حەزی خۆدەرخستنە** کە بە هۆی کۆتە کۆمەلایەتی، خۆدەرخستن، دەمارگیری،خۆبەزلزانی کەسانی دیکە و هەستکردن بەکەمی خودی خۆی سەرهەلدەدا. کاتێکیش پەنای بردە لایەنی دووەم ئیتر قەناعەتی لە دەستدەدا و دواتریش کامەرانی لە دەستدەدا[٦٦] مەگەر بەدەگمەن، کاتێکیش مرۆڤ قەناعەتی خۆی لەدەستدا ئیدی بە هیچ تێر نابێ. خۆ ئەگەر زۆرینەی دانیشتوانی

---

٦٥- "دیتۆلیۆ" زانای بەناوبەنگی ئیتالی دەڵێ: ناخی مرۆڤ گۆڕەپانێکی فراوانی ململانێی نێوان خراپە و چاکەیە. بڕوانە: رزگار محمد قادر، چەند وانەیەك لە تاوانناسی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

٦٦- پرسییان لە پێغەمبەر (محمد)(ﷺ): کامەرانی چیە؟ فەرمووی قەناعەتە، قەناعەتیش دژی خۆشەویستی ژیان نیە بەڵکو لەگەڵێتی و کاریشی بۆ دەکات. بڕوانە: دیل کارنگی، چۆن سامان و سەرکەوتن و سەرکردایەتی بەدەست دێنی، وەرگێڕانی: دیار عەلی، چاپی دووەم، چاپەمەنی گەنج، کوردستان، ٢٠٠٧،ل ٨٠.

شارێك رووەو ئەم لایەنە رۆیشتن ئاشکرایە چۆن هەریەکەو هەوڵ بۆ بەرژەوەندی تایبەت بە خۆی دەدات و خەمخۆری بەرژەوەندی تایبەت بە خۆی دەبێت، خەمخۆری بەرژەوەندی گشتی کەمدەبێتەوە و روحی کارکردنیش کەمدەبێتەوە و روحی خەڵکیش گەندەل دەبێ، ئینجا گەندەڵی ڕەوشتیی بڵاودەبێ.

بۆمان دەردەکەوێ چارەسەر و چاکسازی لە دوو ڕووەوە پێویستە بکرێ کە تەواوکەری یەکترن:

**١) دابەشکردن یان دووبارە دابەشکردنەوەی سامان و دارایی:** دابەشکردنی سامان و دارایی بە یەکسانی لە ولاتدا یەك باری ئابووری دروست دەکات لە نێو خەلك بە شێوەیەکی ڕێژەیی. خۆ ئەگەر کات بەسەرچووبوو بۆ ئەم هەنگاوە و خەڵك لەناو یەکتر جیاوازیەکی مەزنیان هەبوو لە ڕووی سامان و دارایی، دەستدەکرێ بە دووبارە دابەشکردنەوەی لە ڕێگەی "خەرجیە تەحویلیەکان" کە لەم بوارە دەولەت هەڵدەستێ بە گواستنەوەی بەشێك لە داهاتی نەتەوەیی لەو چینە کۆمەلایەتیانەی خاوەن داهاتێکی بەرزن بۆ ئەوانەی خاوەن داهاتێکی نزمن[٦٧]، بەمەش ئەو جیاوازیە زۆرەی لەنێوان دارایی کەسەکان هەیە نامێنێ یان کەمدەبێتەوە.

لەلایەکی دیکەش دەولەت هەڵدەستێ بە کۆمەککردنی خاوەن داراییە نزمەکان و بەم ڕێگەیەش زیاتر دارایی کەسەکان یەکسانتر دەبێ. **ئەم چارەیە بۆ نەهێشتنی کاریگەرە خراپەکانی لەکسی دروستکەری فشاری دارایی لەسەر کەس.**

٦٧- انظر: د.طاهر الجنابي، علم المالية العامة و التشريع المالي، توزيع المكتبة القانونية، بغداد، بدون سنة طبع، ص٢٧.



**٢) قەناعەت:** مۆنتسکیۆ دەلێ لەخۆباییبوون لەگەل لەکس هاوتایە، رەوشت بەرزی لەگەل سادەیی و قەناعەتدا هاوتایە[٦٨]، کەوابێ ئەگەر مرۆڤێك خاوەن ڕەوشت بێت و سادەبێ ئەوا قەناعەتیشی دەبێ، بە پێچەوانەوەش، ئەمە خالێك①.

زانای بەناوبانگ (سیگمۆند فرۆید) دەزگای دەروونی مرۆڤی دابەشکرد بۆ سێ بەش، دوو لەوانە (بەرزە خوود) و (نزمە خوود)ە. (بەرزە خوود) ویژدانە، بەشی نموونەیی دەروونە، هەرچی بەهاو پرەنسیپی چاك و بەرزە لەم بەشەیە، مرۆڤ فێری دەبێ لەماڵ و لە قوتابخانە و لە کۆمەلگا و بە تێپەر بوونی کات کەڵەکە دەبن[٦٩]، ناوەرۆکی بەرزە خوود پتر لە سەردەمی منداڵیەوە دروست دەبێت، هەرچەندە جێگیر نیە و دەکرێ لە داهاتوودا بە زیادبوونی ئەزموون و ڕۆشنبیری کەسەکە گۆرانی بەسەر بێت[٧٠]. ئەمەش خالێکی دیکە②.

بۆیە لەم دوو خالە دەردەکەوێ ئەگەر کەسەکان لە منداڵیەوە فێری ڕەوشتیی بەرز و ژیانکردن بە سادەیی و قەناعەتهێنان بکرێن دەبنە کەسێکی پتەو لە کۆمەلگا هەروەك چەندەها زانا پێنج شەش سالی یەکەمی تەمەنی منداڵیان بە بناغەی یەکلاکەرەوەی مرۆڤەکە داناوە، ئەگەریش برێك لە نایەکسانی دارایی لە ولات بەدیکرا ئەوا قەناعەت و ڕەوشت بەرزی کەسەکان ڕێگە نادات بە بلاوبوونەوەی لەکسی خاوەن کاریگەری خراپ.

ئەم هەنگاوە ئەوەندە بە ئاسانی و بەیەکجار نایاتەدی، پێشتر برێك لە یەکسانی دارایی نێوان کەسەکانی ولاتمان دابین دەکرێ، رەفاهیەتیش بە برێکی باشتر فەراهەم دەکرێ لەگەل خزمەتگوزاری گشتی و نەهێشتنی ترس و تۆقاندن و جێگیربوونی سەرتاپای لایەنە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و رۆشنبیریەکان، ئینجا ریفۆرم

٦٨- بروانە: مۆنتسکیۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨.

٦٩- بڕوانە: رزگار محمد قادر، چەند وانەیەك لە تاواناسی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧.

٧٠- انظر: سيغموند فرويد، معالم التحليل النفساني، ترجمة الى العربية: محمد عثمان نجاتي، ط ٤، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩٧، ل ٦٩-٧١.

دەکرێ لە سیستەمی خوێندن لە خوێندنی بنەڕەت و ئامادەیی و خوێنـدنی زانکـۆ و خوێندنی بالاّش قۆناغ بە قۆناغ، ئەو ژینگە دەعبابیانە و ئەو فشارە مەزنـە نـامێنێ لەسەر قوتابیان پاشانیش بار خۆشدەبێ بـۆ هـەنگاوێکی گـرنگ کـە دانـانی کتێبـە دەروونناسی و کۆمەڵناسیەکان لە ناو سیستەمی خوێندن بەم شێوەیە:

❶ بابەتـەکان بـەپێی قۆنـاغی خوێنـدن پتـەوتر دەبـێ (مەبەسـت لـە بابەتـە دەروونناسی و کۆمەلناسیەکانە).

❷ ئەو بابەتانە لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و تایبەتمەند دەوترێتەوە.

❸ بابەتەکان بە نمرە تاقی کردنەوەی لەسەر ناکرێ و ناچێتە ناو کارتی نمرەکان.

❹ ژینگەیەك لەوپەڕی سەربەخۆیی و ڕادەربڕین دروستدەکرێ.

❺ ئەو بابەتانەی دەخوێندرێن سەبارەت ئـەم تایتلانەیـە (کامـەرانی، دلّخۆشـی، سـادەیی، زالّبـوون بەسـەر نیگـەرانی، بلیمـەتی و لێهـاتوویی، دلّنیـایی ئـابووری، قەناعەت...هیتر).

**ئەم خالّەش بۆ نەهێشتنی لەکسی دروستکەری فشاری دەروونی لەسەر کەس.**

فاکتەری لەکس لە بنەڕەتدا مامەڵەکردن لەگەلّی گرانە، بەلاّم بەم دوو هـەنگاوەی ڕابردوو ئیدی کەسەکان لە بارێکی ڕەفاهیەت و قەناعەت دەژین ئەگەر هەلّومەرجێك بۆ خۆڕازاندنەوەش بەکارهات ئەوسا تەنها بۆ ڕێـك و پێکـی بـەکاردەهێنرێ چـونکە تاڕاددەیەك هەمووان ئەو هەلّومەرجەیان دەستدەکەوێ و چیتر کاریگـەرە خراپـەکانی لەکس لەناو کۆمەلگا نامێنێ.



### ٣-٣- ڕۆڵی قانون:

لە ڕاستیدا قانون مامەڵەیەکی ئەوتۆی لەگەلّ لەکسدا نیـە، چـونکە ئـەم بابەتـە زیاتر پەیوەندی بە بنەماکانی ڕەوشت و بنەماکانی ئایین هەیە، هەرچەندە مۆنتسیکۆ دەلّێ "هەموو دەولّەتان دەتوانن قانونی ڕازاندنەوە لـە پێنـاو پێکهێنـانی قەناعـەتی تەواودا دابڕێژن... لەوانەشە هەندێ قانونی ڕازاندنەوە بۆ دروسـتکردنی قەناعـەتێکی نسبی دابنرێ"[٧١]. ئەگەرچی قـانون دەتـوانێ مامەڵـە لەگـەلّ کاریگـەرە خراپـەکانی لەکس بکات تا ڕادەیەك، بۆ نموونە لە ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی ئـەخلاقیی کـە لـە برگەی تایبەتی زیاتر باسیدەکەین[٧٢] هەروەها ئەو گەندەڵیەی لە ئەنجامی ئەم فاکتەرە پەیدا دەبێ مەترسییە بۆ خودی قانون چونکە "ئەو روحەی بـە خۆڕازاندنـەوە توشـی گەندەلّی دێ ئارەزووی دیکە لە ناخیدا سەرهەلّدەدا و بەزوویی دەبێتە دوژمنی قـانون چونکە بە ڕێگر و لەمپەری سەر ڕێگای خۆی دەزانێ "[٧٣].

سەبارەت بەو چارەسەریانەی لە برگەی پێشوو باسمـانکرد پێمانوایـە دوو خالّەکـە ناکرێ قانونێك لە پێناویان دابنرێ لەگـەلّ ئـەوەی دەتـوانرێ چـەخت لەسـەر هەنـدێ لایەنی بکرێتەوە لە (قانونی ڕێکخستنی داهات) کە پێشووتر باسکراوە لەم کتێبە[٧٤]. بەگشتی ئەم چارەسـەریانە لـە ڕێگـای سـتراتیجیەتی حکوومـەتی هـەرێم جێبـەجێ دەکرێن.

---

٧١- مۆنتسکیۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١.

٧٢- بڕوانە برگە (٦ . ٢) و (٦ . ٣) لەم کتێبە.

٧٣- مۆنتسکیۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٧-١٧٨.

٧٤- بڕوانە برگە (٢ . ٣) .

**٤-١- فاکتەری بەهەڵەداچوونی داواکارانی ماڤی ئافرەت لە کوردستان:**

داواکارانی مافی ئافرەت مەبەست لێی ڕێکخراو و کۆمەڵەی ئافرەتان و ژنان جا چ حزبی و چ بێلایەن بێ و ئەو تاکانەش کە بانگێشتی مافی ئافرەت دەکەن.

یەکێك لە دامودەزگا دیموکراسیەکان کە بنەما و پرنسیپە دیموکراسیەکان لە بواری تیۆریەوە دەگوازنەوە بۆ بواری پراکتیك[٧٥] ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیە، لە ناو کۆمەڵگا پێویستە کۆمەڵێك قەوارەی جۆراوجۆر هەبێ کە "سەر بە دەوڵەت و حکومەت نەبن، لەسەر بنەمای خۆبەخشین کاربکەن و بەدوای قازانج نەگەڕێن، بەخۆیان خۆیان بەڕێوەببەن نەك لەلایەن لایەنێکی دەرەوەی قەوارەکە کۆنترۆڵ کرابن(واتە سەربەخۆبن)، لە پێناو هێنانەدی ئامانجێکی گشتی کار بکەن، ئینجا لە دوایشدا بەپێ بەرنامەو پەیرەوێکی دیاریکراودا کاربکەن"[٧٦].

زانای ئابووریناس (مانکور ئۆلسون) لە دیاریکردنی ئامانجی سیاسی ئەم کۆمەلانە بە زمانی ئابووری دەڵێ (کارێك بۆ بەرژەوەندی گشتی)[٧٧]. کارەکانیشیان وەکو وتمان لەپێناو بەرژەوەندی گشتییە ئەویش دەبێ لەو کارانەبێ کە لە لەشساغی و پەروەردە و کەلتوور و باشترکردنی ژیانی خەڵك کاربکەن[٧٨].

---

٧٥- پ.ی.د.ڕزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٦.

76-See: Sara E. Melendez، The Nonprofit Sector Cornerstone of Civil Society، Issues of Democracy، Electronic Journals of the U.S Information Agency، Vol3 No.1، January 1998، p17.

٧٧- آر. الن هایز، دور مجموعات اصحاب المصالح، اوراق الديمقراطية، رقم (٩)، وزارة الخارجية الأميركية، مكتب برامج الأعلام الخارجي، ص ٣.

٧٨- دامەزراوەی میهەن، کۆمەڵگای مەدەنی هێزێکی نوێ، وەرگێرانی: کۆسار فەتاحی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٤٠.

ئەو جۆرە کۆمەڵانە شارەزایی و هەوڵی خۆیان بەکاردەهێنن بۆ باسکردن و وروژاندنی بابەتێك کەس باسی نەکردبێ[79]. ئێستاش کە زەمانی ئینتەرنێتە پێویستە کاربکەن لە چاککردن و تەرکیبیزکردن لە بەرژەوەندی هاولاتیان بەشێوەیەکی کارا[80].

رێکخراو و کۆمەڵەی ئافرەتان[81] شان بە شانی کۆمەڵە و رێکخراوەکانی بوارەکانی دی لە کوردستان دامەزران بە ژمارەیەکی زۆر پاش روخانی رژێمی گۆربەگۆر. پەرلەمانی کوردستان هەڵسا بە دانانی (قانونی کۆمەڵەکان) ژمارە (١٨) ی ساڵی (١٩٩٣) کە لەماددەی (١) دا هاتووە: (رێکخراو بریتیە لە کۆمەڵێك کە سیفەتێکی هەمیشەییان هەیە و لە کەسی سروشتی و مەعنەوی پێك دێت کە دووربێت لە قازانجی ماددی)[82].

بەلاّم بەداخەوە ئەم کۆمەلاّنە لە کوردستاندا رۆڵیان ئەگەر سفر نەبووبێ نزیکە لە سفر[83] بە تایبەتی ئەو کۆمەلاّنەی تایبەت بە ئافرەتانن نەك تەنها رۆلیان سفر بوو بەلّکو لە خوار سفر بوو و کاریگەرێکی خراپیان هەبوو تا ئێستاش لەسەرتاپای ئاستەکان و بابەتەکان. جگە لەمانەش کۆمەڵە و رێکخراوی ئافرەتان و ژنانی تایبەت بە حزبەکانیش هەر هەمان چەشن. مەبەستیش لە زۆرینەی نزیکە رەهای ئەو کۆمەڵە و رێکخراوانەیە.

سەبارەت بە یەکسانی لە نێوان رەگەزی نێر و مێ، پێمانوایە دوو جۆرە یەکسانی هەیە:

٧٩- آر. الن هایز، المصدر السابق، ص٢.

٨٠- ملفین آي. یوروفیسکي، المبادئ الاساسیة للدیمقراطیة، اوراق الدیمقراطیة، رقم (١)، وزارة الخارجیة الأمیرکیة، مکتب برامج الأعلام الخارجي، ص٣.

٨١- بەپێی پۆلێنی مامۆستامان (پ.ی.د رزگار محمد) ئەم جۆرە رێکخراوە دەکەوێتە ژێر (رێکخراوەکانی بەرگریکردن)، بروانە: پ.ی.د رزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٨.

٨٢- بروانە پارێزەر: چێنەر علی جۆلا، خوێندنەوەیەك بۆ قانونی کۆمەلەکانی ژمارە (١٨) ی ساڵی (١٩٩٣)، گۆڤاری پارێزەر، ژمارە (١٨) ی ساڵی ١٩٩٣، ل ٥٨.

٨٣- بروانە: پ.ی.د. رزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٨.



١) یەکسانی لە رووی قانون و مامەڵەکردن.

٢) یەکسانی لە رووی تایبەتمەندی و دەستدان (اختصاص).

داواکردنی یەکسانی جۆری یەکەم کارێکی رەوایە و پێویستە هەردەم هەوڵی بۆ بدرێ و کۆمەڵە و رێکخراوەکان دەبێ بیکەنە بەرنامە چونکە (لێدانی ئافرەت، خراپ مامەڵەکردنی، کوشتنی، ستەملێکردنی....) دەکەوێتە ژێر ئەم جۆرە، هەر ئەمانەشە پێی دەوتری توندوتیژی.

بەلاّم جۆری دووەم هەرگیز ناکرێ باسکرێ چونکە داواکردنی بەدیهێنانی یەکسانی لە رووی تایبەتمەندی و دەستدان دەبێتە هۆی فەنابوونی کۆمەڵگا و رۆژ بە رۆژ تێکیدەشکێنێ و بێهێزی دەکات، وە نابێ هیچ گرنکیەکی وەهای پێ بدرێ و هەرچۆنێکیش بێت قەت بەدینایات، هەولّدان بۆ ئەم جۆرەیان بێهۆدەیە و خودی ئافرەتەکەش تووشی دەردەسەری دەکات و گرفتەکانی زیاتر و زیاتر دەکات. ئەوەی دەکەوێتە ژێر ئەم جۆرەیان جیاوازیەکی سروشتیە لە رووی شێواز و ناوەرۆك (هەموومان دەزانین نێر و مێ لە رووی روخسار و پێکهاتەیان جیاوازن لە یەکتر، لە رووی ناوەرۆکیش جیهانی ئافرەت زۆر دوورە لە جیهانی پیاو و ئەگەر ئافرەتێك خۆی کردە نێو جیهانی پیاوەوە لە وێ نامۆ دەبی وە هەرگیز ناتوانی بەردەوام بێت) لە نموونە سادەکان: کچێکی بچووك ماڵماڵانێ و یاری بە بووکە شووشە دەکات و کورێکی بچووکیش تۆپانێ و یاری بە ئۆتۆمبێل دەکات و ئەستەمە رازیبن یاریەکانیان بگۆرنەوە، پیاو و ژن دەهێنێ و ئافرەتیش شوو دەکات رۆژێك نەماندی پیاو شوو بکات و ئافرەت پیاو بهێنێ).

بۆیە پێویستمان بە نەخشە و پلان هەیە بۆ بەدەستهێنانی یەکسانی نێوان دوو رەگەزەکە و نەهێلّدرێ جۆری دووەمی تێدا بێت، ئینجاش دووبارە بخرێتە ژێر توێژینەوەی زانستی[84].

٨٤- هەر بۆیە (پ.ی.د.رزگار محمد) لە بابەتی بنچینە و پرنسیپەکانی کاری کۆمەڵە و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چەند پرنسیپێکی ئاماژە پێداوە کە یەکێك لە وانە (بەرێوە چوونیانە بە پێ بەرنامە و پەیرەوێکی رێکخەر).

کەچی گەر ببینین  ئەو کۆمەڵانەی پاڵپشتی و داوای مافی ئافرەت دەکەن کە باس لە هۆ و حجەت و بیانوەکانیان دەکەن کە لە پێناوی ئەوە داوای مافی ئافرەت دەکەن ئەو بابەتانە دەڵێن کە لە یەکسانی لە ڕووی قانون و مامەڵەکردنە، کەچی کە دێنە سەر داواکاری و ئەو شتانەی کردوویانەتە ئامانج بۆ بەدیهێنانی وە هەوڵی بۆ دەدەن ئەوا باسی ئەو بابەتانە دەکەن کە دەکەوێتە ژێر خاڵی دووەم (یەکسانی لە ڕووی تایبەتمەندی و دەستدان). بۆیە کۆمەڵگای کوردی تووشی هەزارەها کێشە بووە و لە ژێر ئەم هەولانە چەندەها خێزان تووشی هەڵوەشانەوە هات و تا ئێستاش دیاریدەی خۆکوشتنی کوڕان و کچان هەر بەردەوامە بگرە لە زیادبوونە و ڕووەو تێکشانی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان و بنەماکانی رەوشتە، ئەمانەش رەنگیانداوەتەوە لەناو کۆمەڵگا لەوەی بەشێك لە ژنەکان خۆیان بێبەری دەکەن لە زۆر لەو ئەرکانەی کە لەسەریانە وەك هاوسەرێك ئەنجامی بدەن و پێویستە بۆ مانەوە و دروستی خێزان.

ئەمە هەمووی شوێنەواری ئەو هەڵە تێگەیاندنەیە کە کۆمەڵەکان و هەندێ داواکاران تووشی کۆمەڵگایان کردووە، هەڵە تێکەیشتنیش لە ماف و ئەرکەکان لە ناو خێزان بۆتە فاکتەرێکی گەورەی تەلاق و جیابوونەوە.

لە ئەنجامی هەڕەمەکی داواکاری ئەم کۆمەڵانە و داواکارانی تر، ئەم هەلانە بەدی دەکرێ [85]:

---

بڕوانە: پ.ی.د. رزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٧.

٨٥- نموونە زۆرە لەم بارە، هەندێك لەوانە:

❶ ڕووناك ڕەئووف سەعید (کە ئێستا بەرپرسی سەنتەری ڕاگەیاندن و ڕووناکبیری ژنانە، هەر لە سەرەتای ژیانی ڕێکخراوەییانەوە کادرێکی چالاکی ڕێکخراوی یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بووە)، دەڵێ:

-"من توندڕەوم" پاشان دەڵێ (ئیسلام هەر هەمووی زیانە بۆ مافی ژنان، ئایینی ئیسلام منی بە پلە دوو داناوە).

-مەلایەك گوتی ژن میوانە.



-لە میراتدا ژن یەك بەشی هەبێت و پیاو دوو بەش، بۆچی پیاوێکی نەزان و ژنێکی زانا ئاوا حیسابیان بۆ بکرێت.

-ئایینی مەسیحی یەکسانی تێدایە.

بڕوانە: ڕووناك رەووف سەعید، گۆڤاری بزاو ژمارە (١٢) ئابی ٢٠٠٧ ل ٣٧.

وەلامی ئێمە بۆی:

-خۆی داندەنی کە توندڕەوە و کە دەڵێ ئیسلام هەمموو زیانە بۆ ئافرەت ئێمە چاك شارەزاین کە ئەم قسەیە راست نی یە، وەك وتەی خودای مەزن (وعاشروهن بالمعروف) واتا (هاوژینیان بە جوانی لەگەڵدا بەرنەسەر) (سورة النساء ١٩) بڕوانە: بورهان محمد امین، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، بلاوکراوەی کتێبخانەی رۆشنبیری، سلێمانی – هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٨٠.

و (ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف) واتا (ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بەوێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان بە گوێرەی باوو نەریتێك کە پەسەندە لە ئیسلام)(سورة البقرة ٢٢٨) بڕوانە تەفسیری ئاسان، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦. و هیتریش. ووتەی پێغەمبەر (د.خ) (الا ان لكم على نساءكم حقا و لنسائكم عليكم حقا)(حسن) و هەزارەهای دیکە، بەڵکو گەر مرۆڤ بیتوانیایە ئایینی ئیسلام تەواو جێبەجێ بکات یەك ماف نەدەخورا.

-دەڵێ مەلایەك گوتی.. . گەر مەلایەك قسەیەکی کرد ئەو قسەیەی بە هەند وەرناگیرێ چونکە ئایا مەلایەکە کێیە، زانە نەزانە، دەلیلی چیبووە؟ خۆ مەلا وتەبێژی ئیسلام نیە تا بە ویستی خۆی قسەی لەسەر بکات...

-لە چوار حالەت ئافرەت نیوەی بەشی پیاو وەردەگرێ لێرە جێگەی باسکردنی حیکمەتی ئەو بابەتە نابێ، بەلام لە کۆتایی قسەکەی خۆی داوادەکات کەسێکی خوێندەوار و نەخوێندەوار جیاوازی بکرێن و یەکسان نەبن واتا چینی خوێندەوار هاولاتی پلەیەك بێت و چینی نەخوێندەوار پلە دوو!.

-دەلێ ئایینی مەسیحیی یەکسانی تێدایە، سەیرەکە لێرەیە چونکە ئایینی مەسیحی پەیوەندی مرۆڤێك لەگەڵ مرۆڤێکی دیکەی ڕێکنەخستووە چۆن ئەبێ باشتربێت لە کاتێکدا بە هیچ شێوەیەك باسی لە ماف و ئەرك و پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان نەکردبێ؟

❷داواکارێکی دیکە دەڵێ:

١. بەکارهێنانی ڕێگەیێکی دوژمنانە و توندەڕەوانە لەو کار و چالاکیانەی ئەنجامی دەدەن.

٢. لە کاتی داواکردنی مافەکانی ئافرەت تەعەددایەکی گەورە دەکرێتە سەر مافەکانی پیاو.

٣. هەوڵەکان تەنها بۆ داواکردنی یەکسانی نابێ بەڵکو بە دانانی ئافرەت بە بەرزتر لە پیاو.

---

-"تا ئێستا قەت بە چاوێکی یەکسانی تەماشای رەگەزی مێینە نەکراوە ئاخر بۆچی؟ نەشەرع!!نە قانون!لەبەرژەوەندی ئافرەت نەدواوە."

-"ئافرەت وەك دیلێك لەسەر تاوانێك بەندکرابێ وەها مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ."

-"خێزان بە هیچ شێوەیەك مافی ئافرەتی نەپاراستووە"،هیتر....

بڕوانە: دایکی لاس، ئافرەت و کۆمەڵگا، گۆڤاری راوێژ ژمارە (٢٠) کانونی یەکەمی ٢٠٠٧،ل١٠.

❸ لەم دەقەی خوارەوە لە لایەك باسی مافخوراوی ئافرەت دەکات و لە لایەك دەڵێ ئافرەت لە هەموو شوێنێکی کوردستان رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە هەموو بوارەکان و خاوەنداری مافی و ئەرکی خۆیان دەکەن:

-کاریگەری ئاینگەرێتی زۆر بە دژواری لەسەر کاروخەباتی ژنان رەنگیداوەتەوە، کە پتر رێ ی لە بەردەم تێروانینی پیاو سالاری و توندوێژی خێزانی خۆشدەکات.

-لە ئاسۆی چارەسەری دەڵێ"ژن هەمان ژنی چاووگوێ بەستراوەی جاران نی یە کە مێرد ببێتە خوای دووەمی" .

بڕوانە: پرسی ژن و دەستنیشانکردنی ئاسۆی چارەسەریی، گۆڤاری گولاڵن ژمارە (٦٧١) شوباتی ٢٠٠٨، ل٣٨-٤١.

❹نەجیبە مەحمود لە ڕادیۆی نەوا (٢٠٠٨\٣\٩) ووتی: (با کچیش ڕێگەی پێ بدری بە سەربەخۆیی بڕواتە دەرەوە بێ لێپرسینەوە) (نەجیبە مەحموود بەرپرسی بەشی گەشە پێدانی ڕێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی ئافرەتانە).

سەدان نموونەی دیکەش....



٤. لە جیاتی بەرژەوەندی گشتی (کە ئەویش خێزان و کۆمەڵگایەکی دروستە) داوای وا دەکرێ دەبێتە فاکتەری تێکدانی خێزان (نموونە: دەوترێ کچ ئازاد بێ کەی دێتەوەماڵەوە).[86]

٥. هێرش کردنە سەر ئایین و کەلتوور و داب و نەریت بە شێوەیەکی گشتی و هەڕەمەکی، بەمەش چاك و خراپ بەیەکەوە دەسووتێ.

٦. تەنها ژمارەیەك پیاو پێویستە قسەکانیان بۆیان ئاراستە بکرێ کەچی ئەوان جەنگیان جاڕداوە بەرامبەر هەموو پیاوێك[87] بە مانای "جەنگی جیاوازکردنی رەگەز بۆ نەهێشتنی جیاوازی ڕەگەز"!!.

---

٨٦- لەزۆرینەی ئەو کۆڕ بەرنامە تەلەفزیۆنی و رادیۆیی و بڵاکراوەکانی دیکە کە بابەتی مافی ئافرەت و ژنانیان کردۆتە تەوەرەی باس، ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ ئەو بابەتانەی باسدەکرێ لەسەر بنەمای رای کەسی(شەخسی) پێکهێنراوە نەك لەسەر ئەساسی توێژینەوەیەکی زانستی و بابەتیانە تیایدا فاکتەرەکانی دروستبوونی توندوتیژی دیاربکرێ و چارەسەریەکان روونکرێتەوە و رۆڵی ئەم چاکسازیە ئاشکرا بکرێ لەسەر بەرژەوەندی باڵای کۆمەڵگا و چاکسازیەکەش دابەشکرێ بۆ چەند پلەیەك لەسەر یەکەی کات و هەنگاو هەنگاو جێبەجێ بکرێ وکاری بۆ بکرێ، لە سەرووی هەمووشیان نابێ هیچ بابەتێ لە خۆبگرێ بەرژەوەندی گشتی بشێوێنێ. کەچی دەبینین زۆرینەی وتەکانیان هەرەمەکین و پەیوەندیان بە بنەماکانی خێزان هەیە کە کۆمەڵگا هیچ مەینەتیەکی نەبینیوە لێیان بگرە بوونەتە مایەی بەختەوەری و پتەوی خێزان لە کۆمەڵگای کوردستانی، ترسی ئەوەشی لێدەکرێ گەر ئەم بنەمایانە تێکبشکێ باری ئافرەت و پیاویش رووەو خراپتر بڕوات.

٨٧- هەر هەمان لەو بەرنامانە ئەو قسانەی دەکرێ دژ بە وشەی پیاو دەکرێ بە گشتی، لەگەڵ ئەوەی زۆر پیاو هەیە خۆی بەژدارە لە نەهێشتنی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان جگە لەمە، لە کۆتاییەکانی (٢٠٠٨) هەفتەیەك راگەیەندرا بۆ وەستان بەرامبەر توندوتیژی دژ بە ئافرەتان، لە زۆربەی کۆڕ و سمینارەکان لە جیاتی وشەی (پیاو) وشەی (سمێڵ زلەکان) بەکار دەهێنرا لەلایەن پێشکەشکاران، ئەمەش روونترە لەوەی رەخنەی لێ بگیرێ.

٧. لە چاوکردنەوەیەکی تەواوی ڕۆژ ئاوا. گرفتەکان و ئایین و سروشت و..هتر جیاوازن لە نێوان کۆمەڵگاکان، لەوانەیە کارێك چارەسەربێ لە کۆمەڵگایەك و تێکشکێنەر بێ لە کۆمەڵگایەکی تر.

ئەو هەڵانەش ئەم کاریگەرانەی هەیە:

١. دوو چین لە کۆمەڵگا دروست دەبێ: چینی ئافرەت و چینی پیاو، دەبنە بەرهەڵستکاری یەکتر و ڕك و کینە و دوژمنایەتی دروست دەکات لە نێوانیان (جا چ ژن و مێرد، خوشك و برا، دوو برادەر...)

٢. پێگەیاندنێکی هەڵە بۆ کۆمەڵگا: چونکە بێ بەرنامەیی لە گەیاندنی بیرۆکەکان بۆ هاولاتیان دەبێتە هۆی ئەوەی هەریەکە لە نێر و مێ لە ئەرکەکانی خۆی کەمکاتەوە و تەنها داوای ماف بکات هەتا لەبابەتێك مافی ئەویش نەبێ.

٣. نەهاتنەدی ئامانجەکانی ئەم کۆمەلانە: لە جیاتی چاکسازی کۆمەلایەتی تێکدانی کۆمەلایەتی دەبێ بە ئەنجام.

٤. تێکشکانی بنەما جوانەکانی کەلتوور و ڕەوشت و ئایین و داب و نەریت و بنەما جوانەکانی مرۆڤ.

٥. زیاتر ڕەشبینکردنی کۆمەڵگا و یەکە یەکەی تاکەکانی لەسەر حاڵی خۆیان. و چەندەها خاڵی دیکە.

ئەمانە هەر هەموویان سەردەکەنە زیاد کردنی کێشە کۆمەلایەتیەکان و بەرز کردنەوەی ڕێژەی هەڵوەشانەوەی خێزان.



## ٤-٢- چارەسەری فاکتەری داواکاران:

### ٤-٢-١- بنچینەی دەسپێکردن:

لە ڕاستیدا کاتی ئەوە هاتووە لێکدانەوەیەکی تەواو و ڕێك بۆ کۆمەڵە و ڕێکخراو و داواکارانی مافی ئافرەت بکرێ، چیتر بەم شێوە هەڕەمەکی و شەڕانگێزیە بەردەوام نەبن، کۆمەڵگا هەژاوە لە دەستیان و هەموو لایەکیان تووشی سەرئێشە کردووە و ئەوەندەی چاکەیان کردووە سەد ئەوەندە گرفت و دەردەسەریان بۆ هەردوو ڕەگەز ناوەتەوە. ئەو کەسانە (وشەی کەسەکان لەم بڕگەیە مەبەستمان کۆمەلە و ڕێکخراو و داواکارانی مافی ئافرەتە) پێویستە بگەنە قەناعەت لە هەندێ خاڵی سەرەکی، ئەوانیش:

١. توندوتیژی لە کۆمەڵگاکان دژ بە پیاو و ئافرەت و منداڵە، ئەو توندوتیژیەی دژ بە پیاو دەکرێ زۆرینەی حاڵەتەکانن، هەروەك ئامارە نێودەوڵەتیەکان ئاماژەیان پێداوە کە ڕێژەی قوربانیەکانی توندوتیژی دژ بە پیاوان (١٤٪) و ئەوەی بەرامبەر ئافرەتان دەکرێ تەنها (٧٪) ە[٨٨].

٢. تەنها پیاو بەرپرس نی یە لەو توند و تیژیانەی بەسەر ئافرەت دێت، بەڵکو زۆرجار ئافرەت توندوتیژی بەرامبەر بە ئافرەت ئەنجام دەدات (بۆنموونە لە نێوان: بووك و خەسوو، دایك و کچ، خوشك و خوشك، کچێك بەرامبەر یەکێکی دیکە.. هتر)، هەروەها لە سنووری خێزان زۆربەی کاتەکان ئافرەت خۆی توندوتیژی بەسەر خۆی دەهێنێ بەهۆی خراپی هەڵسوکەوتی و نشووزی لەسەر ئەرکەکانی خێزان[٨٩]، هەروەها (٤٥٪) ی ئەو حاڵەتانە لە گرفتی ئابووریەوە پەیدادەبێ[٩٠].

---

٨٨- انظر: د.خالد محمد صالح، استخدام العنف ضد المراة دراسة تحليلية مقارنة، مجلة تەرازوو، العدد (٣٢-٣٣) سنة (٢٠٠٧-٢٠٠٨)، ص ١٣٩.

٨٩- د.خالد محمد صالح، المصدر السابق، ص ١٦٩.

٩٠- د.خالد محمد صالح، المصدر السابق، ص ١٥٠.

٣. حاڵی پیاو لە کوردستان ئەوەندە خۆشتر نی یە لە حاڵی ئافرەت.

٤. بەشێك لە ئافرەتان و ژنان ئەوەیان بەدڵە کە بەتەواوی لە ژێر پرس و دەسەڵاتی پیاوەکەیانن بەڵکو گەر مێردەکەیان ئەو ڕۆڵە نەبینێ بە توندی ناڕەزایی دەردەبڕن، زۆر ژنیش هەیە دژی داواکاری ئیستای ئەو کەسانەن.

٥. یەکسانی لەسەر بنچینەی شایستەیی و چوستیە (أهلیة و کفائة) نەك لەسەر بنەمای ڕەگەز (بۆ نموونە کاتێك دوو ڕەگەزی جیاواز داوای پۆستێکی دیارکراو دەکەن ئەوا پێدانی پۆستەکە بە یەکێکیان نابێ لەسەر ئەو بنەمایە بێت کە ئەوە نێرە و ئەمە مێ بەڵکو کاوەیان شایستەترە و چوستی زیاترە)[٩١]، کاتێ داوای یەکسانی دەکرێ ئەوا یەکسانی تەنها ماف ناگرێتەوە بەڵکو یەکسانی واتا بەدیهێنانی هاوسەنگی لە نێوان ماف و ئەرکەکان لەو بابەتانەی ملکەچی ویست و ئیرادەی مرۆڤن، ئەگەر مافی کەسێك زیاتربوو لە ئەرکەکانی ئەوا مافی گەل و کۆمەڵگای زەوتکردووە و بە پێچەوانەوەش[٩٢].

٦. زۆر داوا دەکرێ وەك وڵاتە پێشکەوتووەکان بین، کەچی ئەو توندوتیژیەی لەو وڵاتانە بەرامبەر ئافرەت دەکرێ دەیان ئەوەندەی وڵاتی ئێمەیە[٩٣].

---

٩١- سمینارێکی (پرۆفیسۆر د. مستەفا ئیبراهیم زەلمی) لەسەر (فەلسەفەی قانون)، (٢٠٠٩\٣\١) لە هۆڵی مەدرەجی کۆلیژی قانون و رامیاری — زانکۆی سەلاحەددین.

٩٢- أنظر: البروفیسور الدکتور مصطفی ابراهیم الزلمي، فلسفة القانون، مؤسسة O.P.L.C للطباعة و النشر، ٢٠٠٨، ص ٥٧-٥٨.

٩٣- ئەو ئافرەتانەی توندوتیژیان بەرامبەر دەکرێ لە وڵاتە نامیەکان بەرامبەر بە (٥٪) ی ئافرەتانە و لە ولاتە پێشکەوتووەکان (١٩٪) ە : د.خالد محمد صالح، المصدر السابق، ص ١٦٩.

ڕێژەی ئەو ژن و ئافرەتانەی لە دەولەتان دوچاری توندوتیژی دەبن (٩٥٪) لە فەرەنسا، (٥٢٪) لە ئەلمانیا، لە ئەمەریکا (٤،٤) ملیۆن، (٢٠٠) هەزار ساڵانە لە هۆلەندا تەنها لە دەست پیاوەکانیان، (٦٤) هەزار لە دانیمارك کە (٦٠٪) ی لە ماڵەوەن، لەهەر چوار ڕۆژێك سێ ئافرەت دەکوژرێ لە ئەلمانیا و (٤٥) هەزاری لەدەست پیاوەکانیان لەبەر توندوتیژی هەڵدێن، و لە بەریتانیا لە هەر سێ



٧. ئەگەر چەند خاڵێك لە کەلتوور و داب و نەریتمان هەیە بە جۆرێکی باش مامەڵە لەگەل ئافرەت ناکات، ئەوا پیاو تاوانبار نی یە هەروەها کەلتوورەکەش تاوانبار نیە، ناشکرێ بەیەکجاری هێرشی بکرێتەسەر چونکە ئەو کەلتوورە بە ڕۆژ و دوو ڕۆژ پێکنەهاتووە بەڵکو بە سەدان ساڵ، بۆیە ناتوانرێ بە ڕۆژ و دە ڕۆژ کاریگەریەکی یەکجاری لێ بکرێ، خۆ ئەگەر ئەم کەلتوورەش ڕەتکەینەوە ئەوا کۆمەڵگا بەرەو فەنابوون دەچێ چونکە کەلتوور و داب و نەریت بنەمای کۆمەڵگان.

٨. هیچ مافێکی ئافرەت بەدەست ناکەوێ بە وەستان دژی پیاو بەڵکو بە هاوکاری پیاو .

٩. ئەگەر مافێك بە چینێك درا زیادە ڕۆیی لێکرا ئەوا مافی چینەکەی تر دەخورێ[٩٤]، ئێمە نامانەوێ سنوورەکانی ماف ببەزێنین و بەرفراوانی بکەین و بیدەینە دەست مرۆڤەکان لە کاتێکدا وەك تفەنگێك بەکاری بهێنن بەرامبەر مرۆڤەکانی تر[٩٥].

١٠. ئافرەتان حاڵیان باشتر نابێ لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست بەوەی زیاتر خۆیان سەربەخۆ بکەن لە خێزان یان کچ و ئافرەتانی زیاتر بنێردرێنە قوتابخانە، بەڵکو باشتر دەبێ کاتێ دادوەرەکان ڕووبەڕووی حزبی ڕێکخراو و پەرلەمانی بەهێز و دادگای سەربەخۆن[٩٦].

---

ڕۆژێ ئافرەتێ دەکوژرێ، و لە فەرەنسا ئافرەتێك هەر پێنج ڕۆژێ، و ڕۆژی ئافرەتێ بەدەست مێردەکەی دەکوژرێ لە ئیسپانیا، لە سالێکدا (٦٠٠) ئافرەت لە ئەوروپا دەکوژرێ...هیتر. انظر: د.خالد محمد صالح، المصدر السابق، ص ١٤٨.

94 بێدار فارس عزیز، فەلسەفەی ´مافی مرۆڤ´ی سەردەم، زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی قانون، ٢٠٠٧، ل ١٣.

٩٥- بێدار فارس عزیز، سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

96- Marina Ottaway، Don’t confuse Woman’s Right and Democracy، Publisher: Carnegie International Herald Tribane March- 30 -2004، P2، available on : <http://www.carenieendoment.org>

١١. هیچ ئافرەتێ ئەم داواکارانەی کاندید نەکردووە تاوەکو لەبری ئافرەتان قسە بکەن یان کەس وەکالەتی وتەبێژی ئافرەتان و ژنانی کوردستانی نەداوە بەوانە تا بەم شێوەیەی ئێستا دوو بەرە بهێننە بەرچاومان گوایە بەرەی خۆیان نوێنەر و شارەزای بەرژەوەندی ئافرەتن و بەرەی بەرامبەریش چەوسێنەری ئافرەتن. لەبەر ئەوە چیتر بەم شێوازە خۆیان بەدەرناخەن.

بۆیە دەبێ ئەو کەسانە لەسەرەتا گشت ئەم خالانە لە پێش چاو بگرن پێش ئەوەی هیچ چاکسازیەك بکرێ تاوەکو تەڕ و وشك لەگەڵ یەك نەسووتێ و کۆمەڵگا تووشی قەیران نەبێت و مەترسی نەکەوێتە بەرژەوەندی گشتی.

**٤-٢-٢- چارەی ئەم فاکتەرە:**

پاش لەپێش چاو گرتنی ئەو خالانەی لە بڕگەی ڕابردوو باسمانکرد ئینجا چییەتی و چۆنیەتی کارەکانی داواکارانی مافی ئافرەت و ژن ڕوون دەبێتەوە، جا ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانە دەبێتە نیعمەتێك بۆ گشت مرۆڤایەتی و جێگای سوپاسی هەمووان دەبن، و بەم شێوەیەی خوارەوە دەکەن:

**١) وازدەهێنن لە شۆرشی توندوتیژی:**

ئاشکرایە ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەوە، بۆیە داواکاران نابنە بەنزین بۆ سەر ئاگر لە کاتێکدا هەوڵی ئەوان چاکسازیە چونکە دەزانن توندوتیژی بە توندوتیژی لەناو ناچێ و وەك بەنزینەکەی لێدێت.

لەم ڕووەوە شۆرش دەپۆلێنینن بۆ دوو بەش:

❶ شۆرشی ماددی.

❷ شۆرشی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی .

دەربرینی هەستی شۆرگێرانەی توندوتیژ و هەوڵ و کۆشش بەم ڕووە لە جۆری یەکەم چەند زیاتر بێت ئامانج نزیکتر دەبێتەوە، تا لە کۆتایی ئەوەی خەونی بۆ



دەدیترا دێتە دی (بۆ نموونە شۆرشی گەلێکی ستەملێکراو دژی حکوومەتە ئیستبدادەکەی).

بەلاَم دەربرینی ئەم جۆرە هەستە شۆرشگێرانەیە لە جۆری دووەم چەند زیاتر بێت ئەوەندە ئامانج و مەبەست و چاکسازی دوورتر دەکەوێتەوە بگرە زەرەر و زیانیشی پێ دەکەوێت (بۆ نموونە: بۆ گەشەسەندنی باری رۆشنبیری قوتابی ئەگەر توندوتیژی لەگەڵ بەکارهات ئەنجام گەلێك لێمان دوور دەبێتەوە، لە بواری توندوتیژی دژ بە ئافرەتان و ژنان ئەگەر جاری شۆرش و جەنگ درا دژ بە ئەنجامدەرانی توندوتیژی ئەوا بارەکە زۆر خراپتر دەبێ و بگرە ئەوانەی ئەم کارەشیان نەکردووە هەلۆێستی بەرامبەر وەردەگرن و مەیلیان بۆ دەچێ) کە دوژمنایەتی پیاو کردرا لەلایەن ژنەوە ئەنجامەکە بەلایەنی کەم تەلاق و جیابوونەوە دەبێ.

بۆیە داواکاران ئەم ڕاستییەیان بۆ ڕوون دەبێتەوە و هێتر لە سنووری خۆیان دەمێننەوە و دەستدرێژی ناکەنە سەر مافەکانی پیاو، لەگەڵ ئەوەی بۆ مافی ئافرەت کاردەکەن بەلاَم دوژمنایەتی پیاو ناکەن و دوژمنایەتی کەلتوور و داب و نەریت ناکەن و دژی ئایین ڕاناوەستن، هەروەك (ئۆگۆست کۆنت) دەڵێ "ئافرەتانی بەشەرەف بە هەموو هەوڵ و کۆششیان هیچ کات ناتوانن کارێکی زیاتر لە هێورکردنەوەی توندوتیژی بکەن"[٩٧] و بۆ باسکردنی چارەنووس و بارودۆخیان ناتوانن شەڕی چاککردنەوەی حاڵیان بە توندوتیژی بکەن، بۆیە هەردەم لەم شەڕانە دۆڕاون و بە تەلاق یان لە بارێکی خراپتر بە کوشتن کۆتایی دێت.

مامۆستامان "پ.ی.د رزگار محمد قادر" لە کتێبەکەی (لەپێناو کوردستانێکی نوێدا) دەڵێ "پێویست وایە هەوڵی چارەسەرکردنی هۆی هۆیەکان بدەین کە تاقە ڕێگایە بۆ نەهێشتنی گرفتەکە، ئەگەر هۆی بنەرەتیش چارەسەرکردرا ئەوانەی تریش بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی چارەسەر دەبێ، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر بیر لە بابەتەکە

٩٧- لێن و. لێنکستەر، خواوەندانی هزری سیاسی، وەرگێڕانی: کامەران محمد پور، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلاَت، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ١٣٥-١٣٦.

بکەینەوە بەبێ قوولبوونەوە لە هۆیە ڕیشەییەکانی و لەو گۆشەوە هەولبدرێ چارەی بکەی ئەوا هەرگیز پێت ناکرێ و پێت چارەسەر نابێت"[98].

داواکارانیش لەمەودوا بە هەرەمەکی هەڵناسن گەمارۆی پیاو بدەن لە کۆمەڵگا و نەفرەت لە کەلتوور و بنەماکانی کۆمەڵگا نادەن و ئافرەتان پڕ خەشم و قینە ناکەن و جاڕیان نادەن دژ بە پیاو، بەڵکو هەڵدەستن بە لێکۆڵینەوەیەکی قوول بێ چاولێکەری و دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر فاکتەرەکانیان بۆ دەردەکەوێ، ئینجا مەودای کارکردنیان بۆ دەردەکەوێ و بەشێوەیەکی زانستی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن.

**۲) ئامانج یەکسانی بەرامبەر قانون و لە مامەڵەکردنە:**

هەروەکو پێشتر باسمانکرد یەکسانی لە نێوان نێر و مێ دوو جۆرە، کە یەکسانی "لە ڕووی قانون و مامەلەکردن" و یەکسانی "لە ڕووی تایبەتمەندی و دەستدان" هەریەکەمان لێکدایەوە. داواکارانیش لەمەودوا باس لە یەکسانی جۆری دووەم ناکەنەوە چونکە دەزانن نایەتەدی و کارکردن بۆیشی لە زەرەر زیاتر نابێ، بۆیە هەموو هەوڵ و کۆششەکانیان بۆ جۆری یەکەم تەرخاندەکەن و بە شێوەیەکی دڵسۆزانە هەوڵی هێمنکردنەوەی ئەو پێشێلکاریانە دەدەن لەو ڕووە. لەم کارەشیاندا گیانێکی دیموکراسیان دەبێ و قبوولی ڕای بەرامبەر دەکەن و ڕێزیشی لێدەگرن، خەمی گەورەیان بەرژەوەندی گشتی دەبێ نەك تەنها و تەنها ئافرەت. بێگومان ئەگەر توانرا بەو شێوەیە بچنە ناو دڵی پێشێلکاران و بدوێن لەگەڵیان و تێیانبگەیەنن کە دەبێ تەبای یەکتربن، ئەو کات مامەڵەکردنی چاك مسۆگەر دەکەن لەگەڵ یەکسانی بەرامبەر قانونیش، لێرەوە لە خەڵك دەگەڕێن بۆ ئەوەی خۆیان لە نێو خۆیان ڕێکبکەون لەسەر لایەنەکانی یەکسانی جۆری دووەم، هەر چۆنێکیش بێت بادام مامەڵەی نێوانیان باشە کەواتە دڵخۆش دەبن، کەسیش لەمە زیاتری ناوێ، بەم شێوەیە کاریگەری خراپ بگرە جیابوونەوە و تەلاق لە ڕێژەی سروشتیەکەشی کەمتر دەبێ.

٩٨- پ.ی.د.ڕزگار محمد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨٦.



**۳) مەزهەبی ئافرەتی پاك:**

داواکاران بە تایبەتی ڕێکخراو و کۆمەڵەکانی ئافرەت و ژنان هەڵدەستن بە ئامادەکردنی سیستەمێك کە باشترین سیفەتەکانی ئافرەتی تێدا کۆدەکەنەوە و هەولدەدەن گشت ئافرەتانی لێ تێبگەیەنن، بە تایبەتی لە حاڵەتێك کە توشی گرفت دەبێ و شارەزا بکرێ سەبارەت بەوەی چۆن ئەو گرفتە چارە بکات و نەهێلێ بگاتە حالەتی توندوتیژی و چۆن وا لەکەسی بەرامبەر بکات بەخۆیدا بچێتەوە و بیکاتە بارێکەوە هەست بە هەڵەی خۆی بکات ئەمەش بە دەرخستنی سیفەت و ڕەوشتە بەرزەکانی خۆی و مامەڵەیەکی ژیرانە.

لەم گۆشەیەدا داواکاران لەگەل هەر کۆمەڵە کەسەو بە زمانی خۆیان قسەیان لەگەڵ دەکەن، چونکە هەر چینێك لە زمانی خۆی تێدەگا، مەبەستمان لە زمان ئەوەیە بۆ نمونە قانون ناسێك گەر دانیشێ باسی زانستی تویکاری بۆ بکەی گران لێت تێدەگا بە پێچەوانەش، بە شێوەیەکی دیکە بلێین گەر ئەو کەسەی دەمانەوێ مامەڵە لەگەڵ بکەین موسڵمان بێت ئەوا بەرنامەی کار و ڕەوشتەکان لە ئاینی ئیسلامی پیرۆز بۆ دەهێنرێتەوە بێگومان هەموومان دەزانین کە ئەو پرنسیپانەی لە ناو ئەو ئاینە باسکراوە گەر بێتە دی بەقەد مسقالێ خراپە ناکرێ، یان کەسێك عەشایەرە بە زمانی عەشایەری لەگەلی دەدوێن...هیتر بەم شێوەیە.

**٤) بەرز ڕاگرتنی خێزان و کۆمەککردنی:**

لەبەر ئەوەی خێزان کرۆکی کۆمەڵگایە، کۆمەڵە خێزانێکی نائاسوودە بە واتای کۆمەڵگایەکی نائاسودە و کۆمەڵە خێزانێکی دڵخۆش و پتەو و دروست یەکسانە بە کۆمەڵگایەکی بە توانا و لێهاتوو، ئەمە ڕاستیەکە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر نی یە. داواکاران هەموو هەوڵێکی خۆیان بۆ ئەم ڕووە تەرخان دەکەن، بادام خێزانێك دڵخۆشبێ و مامەڵەیەکی باشی ئافرەت بکات ئەوا کۆمەڵێك لەم خێزانانە کۆمەڵگایەکی ئاسوودەمان بۆ دروست دەکەن، بۆیە کارەکانیان چڕ دەکەنەوە ناو

خێزان و هەوڵی پتەوکردنی ڕۆڵی ئافرەت دەدەن لە ناو خێزان، ڕۆڵیان دەبێ لە بەهێزکردنی سۆزداری و خۆشەویستی نێوان ئەندامەکانی و ڕێگە خۆشکەر دەبن تا سیفەتە چاکەکانی ئافرەت بە خێزان بناسێنن.

بێگومان بەو خالانەی سەرەوە ئەنجامێکی پڕ بەرهەم و مرۆڤانەمان دەستدەکەوێ. کە ڕەگەزی نێر و مێ لە یەکتر تێگەیشتن و ڕێزی ڕاستەقینەی یەکتریان لەلا پەیدا بوو ئەوکات تەبایی و تێکەڵبوون لە نێوانیان دادەمەزرێ و هەرچی توندوتیژی و ماف خوران و کێشەی کۆمەلایەتی و سەرتاپای قەیرانە کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و دیموکراتی و لایەنەکانی دیکە ڕێگەیان بۆ خۆشدەبێ، لە ئەنجامدا ڕێژەی تەلاق و جیابوونەوە لەم ڕێژە بەرزەی ئیستا دەبێتە خوار ڕێژەی سروشتیش. دەبێ لەوەش دلنیا بین کە ئەم هەنگاوانە بە ڕۆژ و دوو ڕۆژ نایەنەدی، بەلکو پێویستمان بە سەبرە هەروەك (ئەندرۆ متیۆس) لە (دواین رازەکانی ژیان) دەلێ: "قانونی چاندن و دەستکەوت قانونێکی زالە بەسەر سروشت کە ئاوهایە (هەولْ + سەبر و چاوەڕێیی = دەستکەوت)"[99]، بۆیە داواکاران ئەم خالانەی ڕابردوو ڕەچاو دەکەن و چاوەڕێی ئەنجامی ڕاستەوخۆ نابن.

٩٩- ئەندرۆ متیۆس، دواین رازەکانی ژیان، وەرگێڕانی: کارۆ شێخ، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٣٢-٣٤.



## ٤-٣- ڕۆڵی قانون:

قانونێکی گونجاو، ئەگەر جێبەجێ کردرا سەرتاپای بوارەکان دەگەڕێنێتەوە سەر خەت کاتێك لە هێلی خۆی لادەدات. ئەم بارە هەرەمەکی و شلەژاوەی ئیستا لە بواری داواکاران بەدی دەکرێ بەڕاستی پێویستی بە ڕاستکردنەوە و موحاسەبەکردن هەیە، چارەسەرە قانونییەکەی لەم قانونەی خوارەوە دێتەدی.

### قانونی ڕێکخستنی داواکارانی ماف:

ئەم قانونە هەڵدەستێ بە دیاریکردنی هێڵی سوور و پێوەرێك دادەنێ بۆ ئەم بابەتە، ئەمە مانای ئەوە نی یە کۆت و بەند دادەنرێ لەسەر ڕاگەیاندن و ئازادی کەسەکان بەلکو شتێکی ئاساییە چونکە ئەوە وادەکات ئەم داواکارانە لە خالێکی هاوسەنگ بهێننەوە لە نێوان بە دواگەران لە چارەسەر و تێبینی سوودمەند لەم لایەنە و لەگەل ئاگاداربوون لە پێشێل نەکردنی مافی کەسانی دیکە لەم پرۆسەیە و دوورکەوتنەوە لە ڕێچکەی هەرەمەکی.

قانونەکە سەربەخۆیی داواکاران لەو ئاستە دەهێلێتەوە کە مافی کەسانی دیکە پێشێل نەکرێ و هێرشی نەکرێتە سەر لەگەل ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی، مەبەست لێرەش ئەوەیە کەس بۆی نیە بە هەوەسی خۆی دانیشێ ڕەگەزی مێ جاربدات دژی نێر و پێ لە پیرۆزی خێزان بنێ و هێرش بکاتە سەر مافی پیاو و تەکفیری ئاینێك بکەن و ئاینێك بەبێ نرخ لە قەڵەمدەن، یان دانیشن بەشێوەیەکی هەرەمەکی و بێ هیچ بەلگەیەك بە گشتی هێرش بکەنە سەر کەلتوور و پیاو و ئاین... هیتر. خۆ ئەگەر واشیانکرد ئەوکات لەبەردەم دادگایەکی سەربەخۆ یەخەیان دەگیرێ و جگە لەوەی ئەگەر سەر بە میدیایەك یان دەزگایەکی ڕاگەیاندن بێت یان کۆمەڵە و ڕێکخراوێك ئەو لایەنە تووشی زیانێکی دارایی دێت، ئەو کەسەکەی کە زیانی پێگەیشتووە قەرەبوو دەکرێتەوە ئەگەر کەسێکی دیارکراوبێ.

بەرزکردنەوی دەعواش لەسەر ئەو داواکارەی ئەم قانونەی پێشێل کردووە یا ئەوەتا لەلایەن زیانپێکەوتووەوە دەبێ یان لەلایەن داواکاری گشتی دەبێت یان لێکۆڵـەرەکان. دەکرێ جگە لە دادگای سەربەخۆ دەزگا و ڕێکخراوی سەربەخۆ داکـۆکی لـەم قانونـە بکەن.



# (٥)

# کاریگەری ورووژێنەرە سێکسییەکان

### ١-٥- فاكتەری كاریگەری سێكس:

ئـەم فاكتــەرە بــە لوتكــەی گرفتــەكان دادەنــرێ لــەو فاكتەرانــەی خێــزان ڕووەو هەلوەشانەوە و تەلاق دەبەن[١٠٠]. "فرۆید" و زانایان پێیــان وابــوو غــەریزە سێكــسیە سەركوتكراوەكان لە ناو ئەقلی ناوەوە (نەست) جـێگیر دەبـن، كـاتێكیش لـە ئـەقلی ناوەوە جێگیردەبێ ئەوا لەوێدا دەمێنێتەوە، مرۆڤ هەر لە ژێر كاریگەری ئەو دەمــێنێ هەتا ئەگـەر خۆشـی لـەبیری بكـات، ئـەم غـەریزە سـەركوتكراوە هەوڵـدەدا بەهــەر شێوەیەك بێت خۆی دەربازبكات و بێتە دەرەوە و چیتر بەسـەركوتكراوی نـەمێنێ[١٠١]. بـەم شـێوەیە ورووژێنــەرە سێكـسیەكان بــە هــەموو جۆرەكـانی كاریگـەری خۆیـان بەدەردەخەن لەسەر مرۆڤ. بۆیە ئەو گەندەلیە ڕەوشتییەی ئیستا كۆمەڵگاكان بەگشتی لەدەستی دەناڵن و لە كۆمەڵگای خۆشمان لە زیادبوونە، جا ئەوەی كە دەبینـرێ لـەناو بازارەكـان و كۆلێجـەكان و دەرەوە یـان ئـەوەی بەشـاراوەیی دەكـرێ گرفتێكـی زۆر گەورەیە و دەبێتە هۆی گەندەڵكردنی روحی خەڵكی، بەتایبــەتی رۆڵـی ئـافرەت لـەم ڕووە[١٠٢]، هــەروەك مۆنتــسكیۆ دەڵــێ "نــەمانی داوێنپـاكی ئافرەتـان بــە ڕادەیــەك كاریگەری سلبی هەیە و بەئەندازەیــەك عــەیب و كـەم و كـوڕی بەرهەمـدێنێ و بــە

---

100- Maxwell Payne، The most Frequent Cause of Divorce، Published Jul 19/2007، available at: < http://www.associatedcontent.com>.

١٠١- د.عەلی وەردی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧.

١٠٢- بێگومان جل و بەرگی ڕەگەزی نێرینەش لە وڵاتەكەمان گۆڕانكاری بەسەر هاتووە، بەڵام لێرەدا جێگەی سەرنج نیە چونكە زانایان سەلماندویانە كە ڕەگەزی نێرینە دەكەوێتە ژێر كاریگەری ڕوخسار و جەستەی ڕەگەزی مێینە و دەبێتە هۆی بزواندنی ویستە سێكسیەكانی، كەچی جەستە و ڕوخساری نێرینە كاریگەری لە هەستە سێكسیەكانی مێینە ناكات هەتا ئەگەر بێ پۆشاكیش ببینێت دەكەوێتە پێكەنین.

بڕوانە: ئالن پیز و باربارا پیز، ژنان و پیاوان بەرامبەرن؟ نەخێر هەرگیز وا نیە، وەرگێڕانی: سالار عبدالرحمن صالح، چاپی یەكەم، چاپخانەی رەهەند، ٢٠٠٦، ل ٩٢-٩٣.

چەشنێك ڕوحی خەڵكی گەندەڵ دەكا، كە ئەگەر بێتو ولاَتێك تووشـی ئـەو نەخۆشـیە بێت و ئەو بنچینە و پرنسیبە گرنگە لە ناویدا هەرەس بێنێ (داوێنپـاكی)، ئـەوا بـێ شك دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گەلێك ڕۆژە ڕەشی و بەدبەختی گەورە. بە تایبەتی لـە حكوومەتە دیموكراتەكاندا لە ناوچوونی داوێنپاكی دەبێتە هۆی بەدبەختی و فەسـاد و بناغەی حكوومەت هەڵدەتەكێنێ"[١٠٣] ئەمە لەلایەك .

لەلایەكی تر ئەو ئامرازە ئەلكترۆنیانەی كە لەم دواییە پەیدابووە ڕۆڵێكی گـەورەی هـەبووە لە بلاوكردنەوەی گەندەلی ڕەوشتیی (جا چ لە تی ڤی، ئینتەرنێت، ڤیدیۆ، موبایـل...بێـت) و هەروەها ڕۆژنامە و بلاوكراوەكانیش ڕۆلی مەزنی خۆیان لەم لایەنە دەبینن.

بۆیە ئەو گەندەڵیەی ئیستا دەبینرێ لە كۆمەڵگاكەمان (جا لە ڕووی جل و بـەرگ و هەڵومەرجەكانی ئافرەتان و ئامرازە ئەلیكترۆنی و نا ئەلكترۆنیەكان كە زیـاتر لـەم چـوار پێـنج سـالەی رابـردوو پەیـدابوون) دەبێتــە هــۆی دروســتكردنی غــەریزەی سەركوتكراو لە نەستی مرۆڤەكان، لەهەمان كاتدا چـاولەدەری و پەیوەنـدی دەرەوەی خێــزان و دلّپیــسی و لــەكۆتاش خیانــەتی هاوســەریی لێدەكەوێتــەوە. خیانــەتی هاوسەرییش بە فاكتەرێكی بەرچاو دادەنرێ بۆ كۆتایی هێنان بە خێـزان و تـەلاق[١٠٤] . فاكتەری چاولەدەری پیاو یان ئافرەت بۆ دەرەوەی سنووری خێزان بەهێزتر دەبێ ئەگەر كەسەكە گیرۆدەی ئەركێكی دەرەوەی توانای خۆی بێت (بۆ نموونە كـاتێ كەسـەكە لـە بارێكی ئابووری خراپ دەبێ) .

لە بارێكی دیكە سێكس وەك تاكە ئامانج دەبێ لە پێكهێنانی هاوسـەریی لەبـەر كاریگەری ئەو خالانەی پێشووتر باسكران، پێكهێنانی هاوسەرییش تەنها بە ئامانجی سێكس، تێنەگەیشتنە لە ئامانجە سەرەكیەكانی زەواج، بـە رۆڵـی خـۆی فاكتـەرێكی زۆربوونی تەلاق و جیابوونەوەیە[١٠٥] كە دواتر باسیدەكەین.

---

١٠٣- مۆنتسكیۆ، سەرچاوەی پێشوو ل، ١٨٤.

104- See: Divorce Causes، available at< http://www.paralumun.com>.

١٠٥- بڕوانە برگەی (٢-٦) لەم كتێبە.



## ٢-٥- كۆنترۆڵكردنی ئەم فاكتەرە:

درووژێنەرە سێكسیەكان هەر لەگەڵ پەرەسەندنی سەرتاپای لایەنەكان بەكرانـەوەی جیهان لە ڕوومان بە ڕادەیەكی زۆر زیادی كردووە، بەبێ بوونی هیچ جۆرە كۆنترۆلێـك كوردستان ڕووەو بەكارهێنانی درووژێنەرە سێكـسیەن وەك ئامرازێـك بـۆ زیـادكردنی بازاركاری چوو، بەتایبەتی لە بلاَوكراوەكان (گۆڤـار، پـەرتووك، ڕۆژنامـە،...) و لـە میدیا و كلیپ و گۆرانیەكان... .

لەكسیش كە دەبێتە پەیداكەرێكی گەندەلی ئەخلاقیی ڕۆلی خۆی گێڕا لەم بابەتە، ئەو ركابەرێتیەی لە مۆدەی گەنجان بەدیكرا بە تایبەتی لە لای ئافرەتانەوە كـە بـووە هۆی ئەوەی خەڵك قبوولی دەرچوون بكات لەو سـنووورە پـیرۆزەی كـە كۆمەڵگـەمان هەیبوو لە ڕووی شەرم و داپۆشینی جەستە، ئیدی ئافرەتەكان  خۆیان جەستەی خودی خۆیان وەك جوانكاریـەك و ڕازاندنەوەیـەك بـە دەردەخست، كۆمــەڵگا و خێزانــەكان پێـشوازیەكی قۆنـاغ بـە قۆنـاغی سـەیریان بـۆ ئـەم بابەتـە كـرد و بـووە جێگـەی ڕەزامەندیان. خۆ ئەگەر ئەو جل و بەرگـەی كـە بەشـێكی زۆر لـە ئافرەتـانی ئیـستا لەبەریدەكەن بیگەڕێنیەوە دە سـاڵ پـێش ئیـستا دڵنیـاین دەبێتـە جێگـەی لۆمـە و نەفرەتی كۆمەڵگا و خودی كەسەكەش پێی ڕازی نابێ.

ئاشكرایە گەر كۆمەڵگایەك سەرقاڵبێ بـە دوای هـەواو هەوەسـەكانی و بـەدوای درووژێنەرەكان وێلبێ لە چ ژیانێكی سەركەشی و ڕوخساریدا دەژین، ئەو كات ئەگـەر خەڵكانی ناو كۆمەڵگا ئاگایان لە تایبەتمەندی و ڕەوشتیی خۆیان نەبێ ئەوا بەرەبـەرە ئیباحیەت دێتە ناو كۆمەڵگا و خێـزان و پابەنـدبوونیش بـەرەو لەناوچـوون دەچـێ و نرخێكی ئەوتۆی نامێنێ، جـا بـێ باسـكردن كۆمەڵگایـەكی بـێ سـەرووبەر و ڕووەو فەنابوون دەبینین.

ریفۆرم و چاكسازی لەم بوارە ئەوەندە سادە و ئاسان نیە، گەر بە دوو سێ قـسەش دەربڕدرێ خۆشاردنەوەیە لە ڕاستی و ناشارەزاییە لـە ڕێگـەی زانـستی مامەڵـەكردن لەگەڵ ئەم فاكتەرە. بە ڕوون و ئاشكرایی لە كوردستان تێبینی ئەوە دەكەین بە گشتی

خەڵك لە كاری جیددی و هەوڵ و پابەندبوون بە دوور دەكەوێتەوە و پەنا دەباتە بەر شتە كاتی و بێ نرخ و بێ بەرهەمەكان. رادیكالیستە فەلسەفیەكان[106] كە جێرمی بنتام (١٧٤٨-١٨٣٢) و جێمز مێل (١٧٧٣-١٨٣٦) ڕێبەری ئەم ڕێبازەن ئەم لایەنە لێكدەدەنەوە لە ڕێچكە جەوهەرییەكانی بنتام لە مەڕ گریمانەی سێهەمی بنتام كە **"ئامانجی هەر تاكێك گەیشتن بە چێژو خۆ پاراستن لە ئازارەكانە"**[107]، پێمانوایە ئەم گریمانەیە ڕێك جێبەجێ دەبێ لەسەر كوردستان و ئەو سەرسوڕمانیەمان نامێنێ سەبارەت بە هۆیەتی ڕاكردنی تاكەكان لە كارە جیددی و سوودمەندەكان و پەنابردنیان بۆ رووكەشیەت كە یەكێك لەوانیش درووژێنەرە سێكسیەكانە. بۆیە ریفۆرم لەوەدایە بەرلەوەی بمانەوێ چێژێكی زیانبەخش لە خەڵك وەرگرینەوە دەبێ ئەو ئازار و مەینەتیە چارە بكەین كە لە دەستی ڕادەكەن، پاشان ئامرازی ریفۆرمی دیكە بە دوایدا دێت بۆ چارەسەركردن.

ئەو ئازار و مەینەتیانەی خەڵكی كوردستان لە دەستی ڕادەكەن ئەوەندە شاراوە نیە، گەر سنوورەكە تەسك بكەینەوە لەسەر ژن و مێردێك لەدەست چی توشی مەینەتی دەبن، ڕووە هەرە سەرەكیەكان ئەمانە دەبن (بێ دەرامەتی و نالەباری باری ئابووری، كێشە و گرفتەكانی ئاو و كارەبا، نایەكسانی لە نێوان خەڵك، نەبوونی بیمەی كۆمەلایەتی و تەندروستی، نەبوونی رەفاهیەت[108] هیتر...).

**چارەسەری ئەم فاكتەرەمان بۆ رووندەبێتەوە كە دوو هەنگاوە:**

١) ڕیزبەندكردنی ئەو مەینەتی و ئازارانەی خێزاندار و بێ خێزان لە دەستی دەناڵێنن بە پێ ی پلەی كاریگەریان، پاشان یەكە بە یەكەیان چارەسەر دەكرێن و

١٠٦- لێن و. لینكستەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥-١٦٦.

١٠٧- لێن و. لینكستەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٠.

١٠٨- بڕوانە: د.رزگار محمد قادر، لە پێناو كوردستانێكی نوێدا، ل ٥٢٥-٥٤٢.



ڕێگە چارەیی بۆ دادەنرێ، تاوەكو بتوانرێ وا لە خەڵك بكرێ چیتر پەنانەبەن بۆ چێژە زیانبەخشەكان كە لە ئەنجامی ڕاكردن لە مەینەتی و ئازاری چارەسەركراو ڕوویدا بوو.

بۆ نموونە (گەر قوتابیەكی زانكۆ بزانێ دوارۆژێكی چاكی دەبێ ئەگەر هەوڵ و كۆششی خۆی بەگەڕبكات و لە شوێنێكی شیاو بەخۆی دادەنرێ و بە توێژینەوەكانیشی دەتوانێ ئەو بارەی توێژینەوەی لەسەر كردووە بگۆڕێ، ئەوا ئەو قوتابیە چیتر كاتی ئەوەی نامێنێ گوێ بە شتە بێ نرخ و بێ بەهاكان بدات لەبری خزمەتكردنی بواری پسپۆریەتێكەی).

٢) لە هەنگاوی دووەم هەندێ هەوڵ دەدرێ تا باری ئیستا زیاتر كۆنترۆل بكرێ هەروەها بارەكەش بۆ داهاتوو گونجاوتر دەكرێ:

**أ) چیتر ڕێگە نادرێ بلاۆكراوەكان و راگەیاندنەكان بازرگانی بە جەستەی ئافرەت بكەن**

چونكە ئیستا چەندەها گۆرانی بێژمان هەیە بە ئاستەم دەنگی هەیە بەس بە دوو سێ ئافرەتی ڕووت و قوت بە كلیپ ڕەواج بۆخۆیان پەیدا دەكەن، ژمارەیەكی زۆر لە گۆڤار و رۆژنامەكان هەیە لە وێنەی بەدڕەوشتیی و ڕووت و قووت زیاتری تیا نیە و چ نرخێكی رۆشنبیریشی نیە و بابەتەكانیشیان زۆربەزۆری درووژێنەر و لە خەت دەركەرن... . لە ڕاستی ڕیگرتن لەم جۆرە بلاۆكراوانە ڕێگرتن و كۆت و بەندی نیە بۆ ئازادی بەڵكو ڕێگرتنە لە ئیستغلالكردنی هاولاتیان و خراپ بەكارهێنانی ماف و پاراستنی ژیانی مۆراڵی خەڵكە، بێگومان گەر كارێك زیانی بەرژەوەندی و سەلامەتی كۆمەڵگای تێدابوو بە ئازادی دانانرێ ئەگەریش كەسانێك داواكارین و بە ئازادی خۆیانی دابنێن.

**ب) ڕێگرتن لە بلاۆبوونەوەی وێنە و سی دی و ڤیدیۆی بەدكاری:** ئەوەش بە دانانی چاودێریەكی پتەو لە بازارەكان و فرۆشیاری سی دی و سۆفتوێری مۆبایل و كۆمپیوتەر، و دانانی چاودێریەكی ورد لە قوتابخانەكان و دانانی لێژنەیەك بۆ ئەم مەبەستە، دانانی فەرمانبەری شاراوە بۆ لەناو قوتابیەكان، لە ڕاستی ئەم جۆرە شتانە لە زیان زیاتری نی یە.

ج) **چالاككردنى ڕۆڵى خێزان لەم ڕووە**، جا بە هۆى كەناڵەكانى ڕاگەياندن و بەڕێوەبەر و مامۆستاى قوتابخانەكان و دابەشكردنى پۆستەر، هەروەها ڕۆڵى كۆمەڵە و ڕێكخراوەكانى ئافرەتان و ئەوانى ديكەش لەم ڕووە بە هێز دەبێت كاتێك هەوڵى خۆيان بەگەڕ دەخەن داواى داوێنپاكى لە ئافرەتان و پياوان دەكەن.

د) **چاودێرى لەسەر قاوەخانەكانى ئينتەرنێت دادەنرێ**، سا ئەو كەسەى تەمەنى (١٨) ساڵى تەواو نەكردبێ دەبێ لە ژێر چاودێريەكى بەهێزى خاوەن قاوەخانەكە ببێ ئەگينا كاتێك چاودێر دەرەكەوێ (چاودێرى تايبەت تەرخاندەكرێ لە قاوەخانەكان دەگەڕێ) و پێشێلكارى ببينێ ئەوا خاوەن قاوەخانەكە بەرپرسيار دەبێ.

ه) **تادەتوانرێ سانسۆر بكرێتە سەر ئەو ماڵپەڕانەى بۆ كارى داوێنپيسى تەرخانكراون**، شايەنى سەرنجە حاڵى حازرى ژمارەى ئەو دەوڵەتانەى سانسۆر دەخەنە سەر تۆڕى ئينتەرنێت لە زيادبوونە و ئێستا زياتر لە **٢٥** دەوڵەت ئەم ڕێگەيە بەكاردەهێنن[١٠٩]، بۆيە پێويستە حكوومەتى هەرێمى كوردستان ئاگاداربێتەوە لەم ڕووە و ئەو كەسە لە خشتەبراوانە بگەڕێنێتەوە كە بەم ماڵپەڕانە ژيانى خۆيان و كۆمەڵگايان هەراسانكردووە و سانسۆر لەسەر ئەم ماڵپەڕانە دابنێ.

١٠٩- بڕوانە: هێمن تاهير، گوگل دژى ئەو حكوومەتانە دەوەستێتەوە كە سانسۆر دەخەنە سەر ئينتەرنێت، وەرگيراو لە (DW)ى ئەلمانى، ڕۆژنامەى خەبات ژمارە (٢٨١٦) لە (٢٠٠٨/٤/١٢)، ل٧.



## ٥-٣- ڕۆڵى قانون:

قانوندانەرى باش لەسەرى پێويستە داوا لە خەڵك بكات داوێن پاكبن و چاوەڕوانى هەيبەت و ڕەوشت بێ لە ئافرەتان[١١٠]، بۆيە لەو دەق و قانونانەى كە دەريدەكات تا پێى دەكرێ هەوڵى گەڕاندنەوەى خەڵكى دەدا بۆ سەر خەتى ڕاست و داوێن پاكى، شايەنى سەرنجە زۆرينەى هزرمەند و زانا و فەيلەسوفە بەناوبانگەكان ئەو ڕاستيەيان زانيوە كە داوێن پاكى و ڕەوشت بەرزى و دوور بە دوورى لە سووك و چرووكى وڵات بەرەو پێگەيشتوويى و كاملى دەبات.

كاتێك كارێك بە تاواندەكرێ ماناى ئەوە نيە هۆى بە تاوان دانانى ئەوەيە گەر ئەنجامدرا ئەوە ڕاستەوخۆ كۆمەڵگا تێكدەشكێ و يەكسەر بارى جێگيرى و سەقامگيريى لە دەستدەدا، بەڵكو بۆ تاوانكردنى كارێك ئەوەندە بەسە كارەكە هەڕەشە لەسەر بەرژەوەنديە سەرەكيەكانى كۆمەڵگا دروستبكات، ئەگەريش بە تاوان دانەنرێ و سزاى بۆ دانەنرێ ئەنجامدەدرێ و دووبارە دەكردرێتەوە لە لاى تاكەكان بەمەش مەترسيەكى گەورە لەسەر بەرژەوەنديەكانى كۆمەڵگا دروستدەكات، ئەمەيە فەلسەفەى بە تاوانكردن[١١١].

قانوندانەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەى ئەو مەترسيانەى كە تووشى كۆمەڵگا هاتوون لەم بابەتە پێويست بە بەتاوانكردنيان دەكات، لە بەرامبەريشيدا سزاى جينائى و مەدەنى بۆ دادەنێ چونكە ئەگەر جێبەجێكردنى قانون جێ بهێڵرێ بۆ ويستى تاكەكان لە جێبەجێكردن يان نا ئەوا قانون وەزيفەى خۆى لەدەستدەدا[١١٢].

قانوندانەرى كوردستانى هەڵدەستێ بە بەتاوانكردنى ئەمانەى خوارەوە لەگەڵ دانانى سزا بۆيان:

١١٠- مۆنتسكيۆ، سەرچاوەى پێشوو، ل١٨٤

١١١- أنظر: د.حسنين المحدي البوادي، المصدر السابق، ص٧٦-٧٧.

١١٢- أنظر: د.حسن كيره، المدخل الى القانون، منشاة المعارف، بدون سنة طبع، ص٣٨-٤٠.

❶ هەر بلاۆکراوەیەك ( گۆڤار، رۆژنامە، پەرتووك...) وێنەی نابەجێی ئافرەتی بلاۆکردەوە ئەوا سزایەکی دارایی دەدرێ، ئەگەر دووبارەی کردەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دادەخرێ، خۆ ئەگەر هەمدیس هەڵسا بە کارێکی وەها ئەوا بەیەکجاری دادەخرێ. ئەگەر خاوەنەکەی کەسێکی سروشتی بوو ئەوا مامەڵە لەگەڵ ئەو دەکرێ.

❷ هەرکەسێ بازرگانی بەو جۆرە شتانە بکات (ڤیدۆ، سی دی، وێنە ...ی خراپ)، ئەوا ئەو کەلوپەلانەی لێ دەستگیر دەکرێ و سزایەکی دارایی دەکرێ، ئەگەر دووبارەیکردەوە حەبس دەکرێ.

❸ ئەگەر خاوەن قاوەخانەیەکی ئینتەرنێت رێگەی بە ناکامێك (قاصر) دا بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت بێ ئەوەی چاودێری بکات ئەوا غرامە دەکرێ، ئەگەر ئەم بارەی لا دووبارە بووەوە تاماوەیەکی دیاریکراو قاوەخانەکەی دادەخرێ، ئەگەریش هەمدیس دووبارە بووەوە ئەوا بۆ ماوەیەکی درێژتر دادەخرێ. ٦



# (٦)

# ڕۆڵی ئایین و ڕەوشت و شارەزایی و خۆهەڵقورتاندن و ئامراز و پێوەرەکانی هەڵبژاردن

## ٦ -١- فاكتەرەكان:

### ٦-١-١- لاوازبوونی كاریگەری ئایین لە كردەوەدا:

ئەوەی ئێستا بە زەقی لە كۆمەلگامان تێبینی دەكرێ ژمارەیەكی یـەكجار زۆری كەسەكان موسڵمانن و ئەركە ئاینیـەكانیان لـە نوێـژ و چـوونە مزگـەوت لـە ڕۆژی هەینی...و هیتر جێبەجێ دەكەن كەچی بڕێكی زۆریشیان تەنها بە ڕوخسار لەسەر ئەم دینەن و ئەوەی ئایینەكەیان داوایان لێدەكات لە كردەوە و نیەت جێبەجێ ی ناكـەن، لەلایەك دەبینی لە مزگەوت دەگری و لە دەرەوەش قۆڵ دەبری.

سەرجەم ئایینەكان لە بنەڕەتدا هـەوڵی گەیانـدنی مـرۆڤ دەدەن بـۆ چـاكەكاری و ڕەوشت بەرزی و هەموو شتێكی باش و بەرز، ئایینی ئیسلامیش نموونەیـەكی بـەرزە لەم ڕوانگەیە، بەتایبەتی ئەم ئایینە پەیوەندیە كۆمەلاَیەتیەكانی ڕێكخستووە، لێرەدا ناچـینە نـاو شـەریعەی ئیـسلامی چـونكە بابـەتی مامەڵـەكردن لەگـەڵ هاوسـەر و بەرێوەبردن و پێكهێنانی خێزان و ئەرك و مافەكانیان و مامەڵەكردن لەگەل گرفتەكان و هەلوەشانەوە و تەلاق و هیتریش ئەمانە چەندەها پەڕ دەگرنەوە. گەر ئەم داواكـاری و ڕێنماییانـە لـەلای هـەر هاوسـەرێ جێبـەجێ بكـرێ ئـەوە خێزانێكـی پتـەو و كۆمەڵگایـەكی دروسـت پێكـدێت، خـۆ ئەگـەر بـە پێـچەوانەی ئـەم داواكاریانـە هەڵسوكەوت كردرا و بەبێ شارەزایی و سەبر بـوون، ئاشـكرا دیـارە چـۆن كۆمـەڵگا ڕووەو هەڵوەشانەوە و دارمان دەڕوات.

### ٦-١-٢- تێکشکانی بنەماکانی ڕەوشت:

مرۆڤ هەر کە لەدایك دەبێ لەسەر بنەمایەکی چاك و پاك لەدایك دەبێ[١١٣]، خودای مەزن لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ)[١١٤]. یەکەم مەبەستی شەریعەی ئیسلامی لە زەواج پاراستنی ڕەوشتە، زەواجیش کە زۆر گەورەیە لە ئیسلام بەلاّم ئەگەر مەترسی لەسەر ڕەوشتی دوو هاوسەرەکە هەبوو دەبێ ئەو زەواجەش هەڵوەشێ[١١٥].

کۆمەڵگای ئێمەش کۆمەڵگایەکی زۆرینە موسڵمانە و ئایینیش یەکێکە لە سەرچاوەکانی بنەماکانی ڕەوشت[١١٦]، شەریعەتی ئیسلامی زۆر بە تێروتەسەلی باسی لەم بابەتە کردووە و بنەمایەکی پتەوی بۆ داناوە، بەتایبەتی لە مامەڵەکردن لەگەڵ خێزان و منداڵ و ... لەم بارە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (انما بعثتُ لأتمم مكارم الاخلاق).

---

١١٣- د. محمد شلال حبيب، تأملات في تربية الشباب و تحصينهم ضد الجريمة، مجلة القانون المقارن، العدد(١٩) سنة ١٩٨٧، ص٩.

١١٤- سورة الروم (٣٠).

١١٥- " اول هدف لقانون الزواج الاسلامي هو حماية الاخلاق فهو يحرم الزنا و يلزم النوع الانساني بشقيه رجال و نساء بان يجعل علاقته الفطرية تخضع لقانون يحفظ الاخلاق من التحلل و يحمي المجتمع من الفساد و لهذا عبر القرأن الكريم عن الزواج بلفظ الاحصان فالحصن: هو قلعة و الاحصان: يعني التحصن داخل القلعة و المتزوج يقال له (محصن): كانه يبني حصناً و قلعة و المراة المتزوجة تسمى (محصنة) يعني انها دخلت في حماية هذا الحصن الذي بنى لحماية اخلاقها و صون نفسها في حالة الزواج... الا انه حيث يكون هناك خوف من ان يلحق الاذى و الضرر بالاخلاق من جراء البقاء داخل هذا الرباط فانه يعتبر حل عقد الزواج امرا ضرورياً للحفاظ على هذه الثروة..."

انظر: د.احمد مصطفى سليمان ، نظام الاسرة في الاسلام ، مجلة پارێزەر ،العدد(١) سنة ٢٠٠١، ص٢١٦-٢٦٢ .

١١٦- انظر: عبدالباقي البكري و زهير البشير، المدخل لدراسة القانون، بيت الحكمة، ١٩٨٩، ص ٦٢.



ئەوەی ئێستا تێبینی دەکرێ لەو ڕێژە زۆرەی تەلاق و جیابوونەوە لە کۆمەڵگامان، جێبەجێنەکردنی ئەو بنەما ڕەوشتییە بەهێزانەیە کە شەریعەی ئیسلامی دایناوە و ڕەنگنەدانەوەیەتی لە مامەڵە و ژیانی ڕۆژانە وەك پێویست، جا ئەمە چ لەڕووی ژن و مێردەکە بێت و چ لەڕووی کەس و کاریان سەبارەت بەخۆتێهەڵکێشان و نانەوەی گرفت و تەگەرە لە ڕێگایان. لە ڕاستی ئەم بوارە گرانە باسکردن و هێنانەوەی بەڵگە بۆی بەلاّم بە ئاسایی لە دادگا و ژیانی ڕۆژانەمان بەدی دەکرێ و هەستی پێدەکرێ. جا ئەو کۆمەڵگایەی بنەماکانی ڕەوشتیی تێدا تێکشکا گرانە مرۆڤەکان ڕێز لە حیکمەتی هاوسەرگیری و سەبر[١١٧] و خۆبەخشین... بگرن، تەلاّقیش ئاسایی لە زیادبوون دەبێ کاتێك دوو هاوسەر ڕەوشتیان تەواو نەبێ لەگەڵ یەکتر و کەسانی دیکە.

هەروەك پارێزەر (خزر شەوقی داوودی) کە ٣٠ ساڵە لەم کارەیە ووتی: کێشەی ڕەوشتیی فاکتەرێکی گرنگی زۆربوونی تەلاّقە، پێویستمان بە زیاتر گرنگیدان بەم بوارە هەیە).

گەر سوید بە نموونە وەربگرین، زۆرترین ڕێژەی تەلاّقی هەیە کە ٥٤,٩٪ی زەواجەکانە بە پێ ی ئامارێکی جیهانی بەهۆی ئەو فەسادە ڕەوشتیەیە کە ئەو ولاّتەی گرتۆتەوە[١١٨].

### ٦-١-٣- ناشارەزایی لە پیرۆزی و ئامانجە سەرەکییەکانی زەواج:

ژیانی هاوسەریی قوتابخانەیەکە تێیدا مرۆڤ گەشتێك بۆ ناو فەلسەفە و حیکمەتی ژیان و بوونی مرۆڤایەتی دەکات، قانونەکانی هاوسەرداریی تێماندەگەیەنێ ئەو ژیانە تەنها خۆشی نی یە، و ژیانێکیش نی یە مرۆڤ بگەیەنێتە خەونەکان، بەڵکو

---

١١٧- انظر: عمرو خالد ،الصبر و الذوق،ط ٣ ،دار المعرفة للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت ،٢٠٠٤، ص ٧-٢٠.

118- World Divorce Statistics، available at: <http://www.dirorcemag.com>.

هاوسەرداریی واتە "ئەو پەیوەندییەی کە ئەبێ نیوەی حەزو خواست و ئارەزوەکانی خۆتی تێدا لەدەست بدەیت، واتە دۆڕاندنی ٥٠٪ و تیهەڵچوونی ١٠٠٪ لە ژیانی کەسێکی دیکە، چونکە کە کەسێك دەکەیتە هاوسەری ژیانت پێویستە لە هەموو چاکی و خراپیەکانی بە هاوبەشی ژیانتی دابینێی..."[119]

تامس هێل گرین (١٨٣٦-١٨٨٢) لە تیۆرەکەی لە مەڕ سروشتی مرۆڤ دەڵێ: مرۆڤ دەبێ ڕازی ببێ بەوەی کە هەموو تاکەکان خاوەن توانا و بەهرەیەکی یەکسانن، واتا ئەگەر داوای مافی کرد بۆ خودی خۆی پێویستی بە ناسینی مافی کەسانی تر دەکات، کاتێکیش چاکەی خۆی دەوێت پێویستە پێشتر چاکەی بەرامبەرەکەی بزانێ[120]. هەڵبەت پێویستە پێش ئەوەی ژیانی هاوسەریی پێکبهێنرێ هەریەك لە دوولایەنەکە شارەزابن سەبارەت بەوەی لە سەریانە ئینجا فکرێك لەوە بکەنەوە کە چی وەردەگرن، خۆ ئەگەر کچ و کوڕێك بەر لەوەی لە ئامانج و مەبەستە هەرە بەرز و سەرەکیەکانی زەواج تێبگەن ژیانی هاوسەریی پێکبهێنن ئەوا زوو بە زوو دوچاری ئەو پێشهاتانە دەبن کە چاوەڕوان نەکرابوو لەلایان و لەجێی ئەوەی بۆخۆیان هەڵسن بە بەکارهێنانی پلانێك کە دەبوو پێشتر ئامادەی بکەن، هەوڵی خۆدۆزینەوە و دەرچوون دەدەن لەو خانە نوێیە کە گانگایە بۆ گۆمەڵگایەکی دروست[121]. هەر بۆیە (هێربت هاکز) دەڵێ "بەبێ مەبەست بەگەمژەیی و گەوجی ملی ڕێگرتن نەك هەر تەنها مایەی نیگەرانیە بەڵکو گەورەترین لەمپەرێکن بۆ گەیشتن بە ئامانج و

١١٩- دیل کارنگی و دوروتی کارنگی، یاساکانی هاوسەرداری، وەرگێرانی: جەبار تەنیا، چوارچرا،سلێمانی ، ٢٠٠٦، ل٩٦.

١٢٠- لێن و. لێنکستەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٥.

١٢١- تێنەگەیشتن و ناشارەزایی لە مانای راستەقینەی زەواج لەکاتی پێکهێنانی لە ئەنجام دروستبوونی هاوسەرگیریەکەیە لەسەر بنەمایەکی نابەجێ، بە زوویی هەردوو لا ئەمەیان بۆ دەردەکەوێ و ڕوو بە ڕووی بەرگەنەگرتن و هەلوەشانەوە دەبنەوە.

انظر: د.علي القائمي، الأسرة و قضايا الزواج، ط٣، دار النبلاء، بيروت، ٢٠٠٤، ص ٢٩.



سەرکەوتنەکان"[122]. ئەم فاکتەرە ئاسایی دەبینرێ لە زۆربەی هاوسەرەکان بە تایبەتی لەوانەی تەمەنیان لە خوار(١٨-٢٠)ساڵیدایە لە کۆمەڵگای خۆمان.

## ٦-١-٤- خۆتێهەڵکێشان لە پەیوەندی هاوسەران:

دوو جۆرە خۆتێهەڵکێشان لەم ڕووە هەیە: یەکێکی ئیجابی و ئەوەیتر سلبی. لایەنی ئیجابی: ❶لە کاتی ئاسایی: ئەوەیە کەسوکاری هەردوولایەن کۆمەکی داراییان دەکەن و ڕێگە نیشاندەریان دەبن و ڕاوێژیان پێشکەش دەکەن و پلانی داراییان بۆ دادەنێن کە چۆن خۆیان پێکبهێنن و کارئاسانی دیکەیان بۆ دەکەن.

❷لە کاتی کێشە و گرفتی نێوان دوو هاوسەرەکەش چاکسازکردنی نێوانیانە، ئەویش تەنها لە کاتێکدا کە دوو هاوسەرەکە لە هەوڵ و کۆششەکانی خۆیان بوونەوە لە چارەکردن و کەسوکاریان لەوە بترسن کە لەیەکتر بترازێن، هەروەك لە قورئانی پیرۆز باس کراوە[123]. لەڕاستی ئەم جۆرە کۆمەککردنە دەتوانین بڵێیین نیعمەتێکی خوداییە.

لایەنە سلبیەکەش،①لە کاتی ئاسایی: خێزان وەك دەوڵەتێکی بچووك وایە، سروشت و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بە پێ ی دوو هاوسەرەکە لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکی دیکە دەگۆڕێ، هەریەك پێناسەیەکی هەیە بۆ ئەرکەکانی پیاو و ئافرەت، منداڵ، کار، هاوڕێ، سەرگەرمی، گەڕان...هیتر، ئەمە ڕێگەیانە بۆ سەرکەوتن، کەچی کەسوکاری هەردوو لا یان یەك لایان بە شێوەیەکی دیکە لەم بوارانە دەڕوانن و بەشێوەیەکی لوژیکی بیر لە سروشت و تایبەتمەندی ئەو ژن و مێردە دەکەنەوە، بۆیە بیرۆکەکانی ئەوان بە هەڵە دەخەنەوە و خۆ هەڵقورتاندن بۆ راستکردنەوەیان بە کارێکی پێویست دەزانن، بێ ئەوەی تێبینی بکەن کە ئەوانیش ڕاستن. ئەو جۆرە کەسانە راستیەکیان لەلا ئاشکرا نەبووە و دانیان بەوە نەناوە کە"هەر مرۆڤێك لە

١٢٢- دیل کارنگی و دوروتی کارنگی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.

١٢٣- أ. جاسم المطوع، تدخل الأهل فى الحياة الزوجية، متاح على الموقع: <http://www.almutawa.info>

سروشتی خۆیدا بە شێوەیەکی تایبەت دروستکراوە، بۆیە هەرچۆن هەوڵبدات ناتوانێت وەك بەرامبەرەکەی لێببێت"[١٢٤]، لێرەدا لەسەر دوو هاوسەرەکە ڕادەوەستێ، خۆ ئەگەر یەکێکیان یان هەردووکیان بۆ هەر هۆیەك بێ هەوڵی جێبەجێکردنی ڕاسپاردەی کەسوکاری بێت لەو بوارانەی پێشتر باسمانکرد ئەوا "توشی ململانێیەك دەبێ لە نێوان ئیرادە و نەستەکانی لە ناخی خۆیدا، هەر بۆیە لە کۆتاییدا توشی دۆڕاوی دەبێت بە هۆی ئەو ململانێیە"[١٢٥] و چیتر بەیەکەوە ناگونجێن. خۆهەڵقورتاندن لە بواری سروشت و تایبەتمەندی خێزانی نوێ بۆ چاکسازی یان تێکدان[١٢٦] بێت هەر ئەنجامی پێشووی لێدەکەوێتەوە.

② لەکاتی گرفت و کێشەدا: ئاسا لە کۆمەڵگامان دەبینین کە کێشەی نێوان ژن و مێردێك هەر کە کەسوکاری پێی زانی چیتر کێشەکە لە نێوان ژن و مێردەکە نامێنێ، بەڵکو دەبێتە کێشەی دوو بنەماڵە یان دوو خێزان، قسەیەك لەم و قسەیەك لەو دەبێتە ناخۆشی، هیتر ئەو کێشەیە دەگۆڕێ بۆ ڕق و کینە و زۆرجار ژن و مێردەکە دەبنە ناوبژیوان، پاشان کەسوکاری هەردوولا هەریەکەیان لەبن گوێی منداڵەکەی دەخوێنێ تا کار لە کار دەترازێ و ژن و مێردەکە دەکەنە دوژمنی یەکتر و سووریان دەکەن لەسەر جیابوونەوە و تەلاق. ئەم بارانە زۆر دەبینرێ لە دادگای باری کەسێتی هەولێر لە میانەی ئەو توێژینەوە و لێپرسینەوانەی لەو شوێنە ئەنجاماندا. توێژەرەوەی کۆمەلاّیەتی (عبدالفتاح صالح) لە دادگای ناوبراو ووتی: "زۆربەی تەلاقەکان کە دێنە

١٢٤- بڕوانە: د. عەلی وەردی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٤.

١٢٥- بڕوانە: د. عەلی وەردی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٤.

١٢٦- زۆربەی دایکەکان کە دەبینن منداڵەکەیان هاوسەرەکەی خۆشدەوێ هەست بە غەیرەت دەکەن و هەوڵی تێکدانیان دەدەن و زۆرجاریش فەرمانی تەلاّقدانیان بۆ دەدەن.انظر: د.محمد عبدالمقصور عفیفي و محمد بن صالح العثیمین و محمد ناصرالدین الألباني و صالح بن فوزان الفوزان و شیخ الاسلام ابن تیمیة و عبدالله بن عبدالرحمان الجبرین و عبدالعزیز بن عبدالله بن باز و محمد بن ابراهیم آل الشیخ و عبدالرحمان بن ناصر السعدي و اللجنة الدائمة للافتاء، المصدر السابق، ص ٣٤٨.



لای من یەکلا کراونەتەوە و پێشتر وانەیان بۆ دراوە و زۆر سوورن لەسەر داواکەیان، لە تەلاق کەمتریان ناوێ".

خۆهەڵکێشانی کەسوکار لە پەیوەندی هاوسەریی بەتایبەتی لەوانەی لە سەرەتای ئەو ژیانەن، زۆرینەی بارەکان بەهۆی دانیشتنی کوڕەکەیە لەگەڵ ماڵی باوکی جا بەهۆی خراپی ماڵی باوکی بێت یان کچەکە مامەڵەی نابەجێ بێت لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ماڵە، هۆی دیکەش هەیە وەك ویستی شەرانگێزی و ناحەزی کەسوکار[١٢٧] و خۆهەلقورتاندن بەهۆی غەیرەت... **ڕووە سلبیەکەی خۆهەڵکێشان فاکتەرێکی بەرچاوی زۆربوونی ڕێژەی هەڵوەشانەوەی هاوسەرییە** لە کۆمەڵگەمان.

## ٦-١-٥- پێوەر و ئامرازەکانی هەڵبژاردنی هاوسەر:

هەرکەس پێوەرێکی هەیە بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر، لێرە ویستمان ئەوە نیە هەڵسین بە لێکدانەوەیەك لەسەر لوژیکی ئەرستۆتالیسی، چونکە تاکەکان سەربەخۆن و هەر تاکێ سروشتێکی تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵکو مەبەستمان کاریگەری سەرجەم فاکتەرەکانی پێشووە لەسەر ئەم خاڵە. ئەگەر بەو شێوەیە لێکی بدەینەوە بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێ کە ئێستا فاکتەرێکە بۆ بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەڵوەشانەوە، بۆ نموونە (کاریگەری لەکس: کوڕان زۆریان دەگەڕێن بەس تا کچێکی جوانیان دەست بکەوێ جا لێیان تێکچووە ئەوە یاری بووکەشووشانێ نیە، کاریگەری تەمەن: کەسی وا هەیە خۆی بچووکە و پێگەیشتوو نیە لەسەر ئەمە زەواج دەکات بە یەکێك ٣٠-٤٠ ساڵ جیاوازی تەمەنی هەیە لەگەڵی یان بەهۆی بچووکی خۆی بە تێنەگەیشتوویی کەسێك هەڵدەبژێرێ، کاریگەری سێکس: بەس کچێ بدۆزێ هیتر گرنگ نیە کێ یە

١٢٧- هەندێك هەیە کە کوڕەکەی یان کچەکەی زەواجی کرد وەك بڵێی لقێك لە ڕێکخراوەکەیەتی، هیتر ڕۆژانە دایکی دەبێ بزانێ منالەکەی لەو ساتەی چاوی کردوەتەوە تا کۆتایی ڕۆژ چیکردوو و بەردەوام ڕاسپاردەی بۆ دەنێرێ بۆ ڕۆژی داهاتوو، بۆیە دەڵێن کوری دایکێتی، یان کورەکە دەڵێ دایکیم خواستووە نەك کچەکە.

بەڵكو چۆنە، كاریگـەری ناشـارەزایی لـە مەبەسـتە سـەرەكیەكەی زەواج: كەسـەكە هەڵناستێ یەكێكی هاوكوف لەگەڵ باری ئابووری و رۆشنبیری و پلەی كۆمەلآیەتی و تەمەن و...هیتر لەگەڵ خۆی بدۆزێ و زۆركەس بێ ئەوەی تێبگەن هاوسـەرییش چـیە بـە تەلـەفۆن قـسەیەكی لەگـەڵ یـەكێ كـردووە مـانی لێـدەگرێ دەلێ تـەنها ئـەوم دەوێ،كاریگەری ...هیتر) .

بـە شـێوەیەكی گـشتی هاوسـەرگیری فەلـسەفە و مەبەسـتەكانی نایاتـەدی بـە هەڵبژاردنی هاوسەر تەنیا بە سۆز یان بە هەوەس یان بە خێرایی و بـێ لێكۆڵینـەوە و فكركردنەوەی دروست و لەسەرخۆیی چونكە ئەگەر هاوسەر بـەم شـێوەیە هەڵبـژێردرا ئەوا دوودڵی و شپرزەیی جێگای ئارامی دەگرێتەوە و ركبوونەوە لە جێی خۆشەویستی و توندی لە جێگای میهرەبانی و جیابوونەوە لە جێی بەردەوامبوون[128] .

جا ئەگەر كەسێك بە پێوەرێك و ئامرازێكی هەڵە هاوبەشی ژیانی هەڵبـژارد، زوو بە زوو دوای هاوسەرگیری هەڵەكانی بۆ دەردەكەوێ، ئەم زەواجانە لە (لۆتۆ) دەچن بـە داخەوەش زۆربەی كاتەكان هەولێكی بێ هۆدەیە.

128 أنظر: البروفيسور د. مصطفى ابراهيم الزلمي، المصدر السابق، ص ١٨.



### ٦-٢- چاكسازی لە فاكتەرەكان:

ئەو پێنج فاكتەرەی پێشوو ئـاڵۆز بەنـدێكی تایبەتمەنـد بـە خـودی مرۆڤەكەیـە، هەروەك پێشوتر ئاماژەماندا هەر مرۆڤەو خاوەن سروشت و تایبەتمەندیەكە جیـا لـە دەوروپشت. ئەم فاكتەرانەش بەستراونەتەوە بە كۆمەڵە پرسـیارێك: جـۆری پەیوەنـدی كەسەكە لەگەڵ خێزانە رابردووەكەی (واتا ئەو خێزانەی تێیدا گەورە بووە)؟ چـۆن ئـەو كەسـەیان پێگەیانـدوە و چـۆن خـۆی پێگەیانـدووە؟ چـی دەزانـێ لەسـەر ئامـانج و مەبەستەكانی ژیانی هاوسەریی؟ بە چ ئامراز و پێوەرێك هاوسەری هەلبژاردووە؟. بـە واتایەكی دیكە: ئایا مەكینەی كۆمەڵگا چ جۆرە مرۆڤێكی لێ دەكەوێتەوە؟. (فرۆید) وایدادەنا سێ قوتابخانە بۆ مرۆڤ هەیە: ماڵەوە، قوتابخانـە، كۆمـەڵگا. بـە گـشتییش هەر چۆنێ بڵێین هەموو مرۆڤەكانیش دەگەرێنەوە بۆ كۆمەڵگا.

ئەگەر مەكینەی كۆمەڵگا مرۆڤی چاك و فریـادرەس و مـەزنی لێكەوتـەوە ئـەوا شایەنی ستایشكردن و ئاوات خواستنە بە مانەوەی بەلام گەر ئەو مەكینەیـە مرۆڤـی ناشایستە و كەم و كـورتی لێكەوتـەوە ئـەوا زەنگـی پێویـستی چاكـسازی دەمێكـە لێدراوە، ئەو كات هەموو چەشنە هەوڵێك بۆ ئەم پرۆسەیە دەبێ بەگەڕ بخرێ.

لێرە پرسیارێك دەكەین: كارگەی كۆمەڵگای ئێمە چ جۆرە مرۆڤێك بەرهەمدێنێ؟ مەبەسـت لـە وشـەی (جـۆر) لـە پرسـیاری رابـردوو گـشت ئاسـتەكانی دەروونـی و كۆمەلایەتی و رۆشنبیری و ئـابووری و هـزری ئـاینی...دەگرێتـەوە. كاتێـك وێنـەی وەلآمی رابردوو دێتە بەر چاومان ئاشنا دەبـین بـەوەی ئایـا تاكـەكانی كۆمـەڵگامان بەرهـەمهێنن؟ پێـشكەوتن لایـان چـاولێكەریە یـان دۆزینـەوە؟ ئاینیـان بـە عـەقل وەرگرتووە؟ روحی كاركردن لایان چیە؟ فەزیلەتی نەتەوەییان لە چیدایە؟ ئـازادن یـان كۆیلە؟ پەیداكەرن یان مشەخۆر؟ ئەشقیان بەرژەوەندی تایبەتە یان گشتی ؟...هیتر.

لە پرۆسەی چاكسازیدا ئێمە مامەڵە لەگەڵ كۆمەڵگا و قوتابخانەكان و كۆلێژەكان و دام و دەزگاكان ناكـەین، هـەروەها مامەڵـە لەگـەڵ كەسـەكانیش ناكـەین بـەڵكو **مامەڵە لەگەڵ ئەقلی كەسەكانی كۆمەڵگامان بەگـەڕ دەخـەین،** ئەمـەش پێدەچـێت

چاكسازیەك بێت كاریگەریەكی فرەلایەن و هەمەچەشنی بەدوواوەبێت. تاكە رێگا بۆ ئەم هەنگاوە **پرۆسەی فێركاریە**، گەرچی تێبینی ئەم پرۆسەیە بكەین لە ولاتمان خۆی لە سنووری فشارێك شاردووە كە قوتابیەكان هەردەم خەریكی ڕاكردنن لە دەستی. جان دێویی (١٨٥٩-١٩٥٢) هزرمەندی بەناوبانگ دەڵی "مەبەست لە فێركردن سەراوژووركردنی جیهانی ئیستایە، نەك تەنیا تێگەیشتن لە جیهانی ڕابردوو... فێركردن پرۆسێسێكی ئامادەكاریە، وەك پێشەكیەكە بۆ شتێكی گرینگتر كە لە داهاتوودا سەرهەڵدەدا"[129]، كەوابێ ئەوە پرۆسەی فێركاری نیە تەنها لە رۆژی تاقیكردنەوە دادت بدا و هیتر لە فكرت نەمێنێ یان تێیدا بابەتێ بخوێنرێ هەم كۆن بێت و هەم سودێكی وەهای نەبێ لە ژیانی ئیستا و داهاتوودا یان پرۆسەیەك هزرمەندان و بلیمەتەكانی ولاتی پێ هەڵنەسەنگێندرێ یان پرۆسەیەك رێگە بە داهێنان نەدا، بەدەر لەوە ئێمە نامانەوێ زیاتر بچینە بابەتە زانستیەكانی خوێندن بەڵكو تەنها سنوورەكەمان تەسكدەكەینەوە لێرە لەسەر بابەتە كۆمەڵناسی و دەروونناسیەكان.

لە پرۆسەی خوێندندا مەبەست لەوە نیە كەسەكە تا چەند دەتوانێ دەرخ بكات هەروەك لە ولاتمان وەهایە بەڵكو بە دڵنیاییەوە هەروەك دێویی هەمان بیرۆكەی هەبوو، دروستكردن و پێگەیاندنی ئەقلێكە كە دوارۆژ شوێنەواری مەزنی بەسەر كەسەكە بەدیار دەخات، جا چ لەڕووی بلیمەتی و داهێنان بێ، چ لەڕووی دروستكردنی مرۆڤێكی خاوەن ڕەوشت و تێگەیشتن و ژیری و بەتوانا بێت لەڕووی كۆمەلایەتیەوە. گەرچی بڕوانیین هیچ گرینگیەكی وەها بەم ڕووە نەدراوە لە ولاتمان بەلام چیتر ئەم هەڵە مەزنە دووبارە ناكرێتەوە.

لە سەرجەم پرۆسە فێركاریەكانیش بنەمایەك لای ئێمە هەیە دەڵێ: "پاداشت بە پێی هەوڵ و ماندووبوونە" ئەم بنەمایە كە بۆتە هۆی زاڵبوونی هەست بەسەر نەست، پێمانوایە لە شەكەتی و ماندووبوون هیچ ئەنجامێكی داهێنەرانەی پەیدانەكرد، بۆیە

١٢٩- لێن و . لینكستەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦٧.



ریفۆرم لەم بنەمایە بە پێچەوانەوە دەبێت، ئەوسا ئەقڵی ناوەوە دەتوانێ مرۆڤ بەرەو كۆمەڵێك سوود ببات كە خودی خۆی ناتوانێ بە هەوڵ و ماندووبوون بەدەستی بهێنێت[130]. پاشان ئەم هەنگاوانە دەنێین:

## ١) پرۆسەی فێركاری لە قوتابخانەكان:

بابەتەكانی (كۆمەڵناسی و دەروونناسی) سەبارەت بە (هەڵبژاردنی هاوسەر، مامەڵەكردن لەگەڵ گرفت، ئامانج و مەبەستەكانی هاوسەریی، ڕەوشتیی نموونەیی، خۆگونجاندن لەگەڵ دەووروبەر، هونەری هاوڕێگرتن، هونەری وتاربێژی، كەسایەتی داهێنەرانە و بلیمەت...هیتر) پلە بە پلە دەخرێتە قۆناغەكانی خوێندن و دەووترێتەوە لەلایەن پسپۆرانی دەرونناسی و كۆمەڵناسی پاش تاقیكردنەوەی شیانیان.

جگە لەمەش ئایینی ئیسلام كە ئایینی زۆرینە كەسەكانە لە كوردستان، وانەی چاكی لەسەر بابەتەكانی پێشوو لێ كۆدەكرێتەوە و لەلایەن پسپۆرانی شەریعە دەوترێتەوە، بەتایبەتی ئەو كاریگەری و چاكسازیانەی لەم وانانەوە دەكرێ ئەنجام بدرێ لەسەر ویژدان و بنەمای كەسەكان زۆر گرانە لە رێگەی دیكە بەدی بهێنرێ.

## ٢) كۆرسی نرخی هاوسەریی:

ئەم پرۆگرامە دوو جۆرە كۆرسی هەیە: پارێزكاری و چارەسەری (وقائی و علاجی). كە بریتیە لە كۆرسێكی چەند كاتژمێری دەوترێتەوە لەناو دادگاكان لە لایەن خاوەن بروانامەی دكتۆرا لە بواری كۆمەلناسی و شەریعەتی ئیسلامی. بەرامبەر پاداشتێكی دراوی كە وەك هاندەرێكە بۆ كەسەكان تا بەژداری ئەم كۆرسە بكەن.

جۆرە پارێزكاریەكەی: ئەو كۆرسەیە كە دوو هاوسەرەكە لەو ساتەی دەبنە هاوسەری یەكتر تا ماوەی مانگێك دوای ئەوە دەرفەتیان هەیە و دەتوانن بەژداری لەم خولە بكەن بەرامبەر پاداشتێكی دارایی هاندەر. جۆرە چارەبیەكەی: ئەو دوو

١٣٠- بروانە: د.عەلی وەردی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٢-١٤٦.

هاوسەرەی داوانامەی تەلاق بەرزدەکەنەوە لە دادگا هەمدیس دەتوانن بچنە ژێر ئەم خولە بە هەمان چەشن پاداشتێکی دارایی بەرامبەر وەردەگرن، بە دڵنیاییەوەش وانەکانی هەریەکە لە کۆرسی پارێزکاری و چارەیی جیاوازە. ئەم کۆرسە لەڕادە بەدەر گرینگە. تیایدا باس لەوە دەکرێ کە زمانی پیاو و ئافرەت جیاوازە[131] و بۆ ئەوەی بەیەکەوە بژین پێویستە لە زمانی یەکتر تێبگەن.

**٣) پرۆگرامی مزگەوتەکان:**

لە راستی مزگەوتەکان لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك چ خوێندەوار یان نەخوێندەوار و هەرچ کارە بێت لە رۆژی هەینی بۆی دەروات، ئەمە هەلێکە پێویستە بقۆزرێتەوە، بۆیە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەڵدەستێ بە دانانی پرۆگرامێکی بەهێز و نوێ بۆ مامۆستای مزگەوتەکان.

١٣١- بڕوانە: ئالن پیز و باربارا پیز، بۆچی پیاوان درۆ دەکەن و ژنانیش دەگرین؟، وەرگێڕانی لە فارسیەوە: جەبار تەنیا و هێمن شەریف، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٦-١٤.



## ٦-٣- رۆڵی قانون:

زمانحاڵ قانون بوونی هەیە تا جۆرە رێکخستنێك بکاتە ناو ژیانی کۆمەڵگا، بەلام سەبارەت بەو پێنج فاکتەرەی برگەی (٦ . ١) لەبەر ئەوەی بابەتەکە زیاتر لایەنی ویژدان و پێگەیشتوویی عەقل دەگرێتەوە و بابەتێك نیە بەرجەستە بێت تاکو قانون بتوانێ بە زەقی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، پێمانوایە رۆڵی قانون لەم فاکتەرانە بەدەر لە ئامادەکردنی بوار بۆ ریکخستنی ئەو پرۆسێسانە زیاتر نی یە.

گەرچی قانوندانەر هەڵدەستێ بە رێگەدان تەنها بە پێگەیشتوو و رێگری لەوەی لە خوار ئەو تەمەنەیە، ئەمیش رۆڵێکی چاك دەبینێ تا گرێنتی بوونی ستاندەرێکی رێژەیی لە شارەزایی و پێگەیشتن لە پێکهێنەری ژیانی هاوسەریی بکات. لە لایەکی دیکەش دابینکردنی ئەپارتمان و باشترکردنی باری ئابووری خێزان هەروەك دادوەر (رەئوف) پێ ی وابوو (٧٥٪) ی رێژەی تەلاق دادەگرێ.

ئەوەی تێبینی دەکرێ کە پێویستی بە رێکخستن هەبێ و نارێکیەکەی شوێنەوارێکی خراپی دروستکردبێ بابەتی خستنەوەی وەچەیە، پێویست وایە **(قانونی رێکخستنی وەچە)** بە زووترین کات هەوڵ و کۆششێکی زۆری بۆ بدرێ تا ئەو هەرەمەکیەی ئیستا لە وەچە خستنەوە هەیە کۆمەڵگا لە شوێنەوارەکانی بپارێزرێ. جێی تێبینیە رێژەیەکی زۆر لە خێزان هەیە منداڵێکی زۆریان دەبێ و بەبێ سەروبەری گەورەدەبن بێ سەرپەرشتیار، ئەمەش بابەتێکە لەوە زیاتر پێویستی بە روونکردنەوە نی یە.

## کۆتایی

ئەو هەوڵ و کۆششانەی مرۆڤایەتی بەدوایەتی لە دابینکردنی ژیانێکی ئاسوودە و سەرفراز یەکجار فرەلایەن و جۆری تایبەتی وەرگرتووە، کەچی کەموکورتی هەرلایەکی پڕکردبێتەوە بابەتێکی دیکەی کەوتۆتە پێش گرفتی بۆ بنێتەوە، پاشانیس تاکە ڕێگەی بۆ دەرچوونی لەم تەگەرەیەش توێژینەوەی بووە لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی و مامەڵەکردنی بووە لەگەڵی. کێشەی زۆربوونی هەڵوەشانەوەی هاوسەریی کە ئێستا باڵی بەسەر کۆمەڵگامان کێشاوە شایەنی لێکۆڵینەوە و شەوخونیە لە فاکتەرەکانی و چارەکردنی پێش ئەوەی ببێتە ڕێگر لە پتەوبوونی کۆمەڵگای کوردی و لەدەستدانی ئاواتەکانی ئێمە و باپیرانمان و دروستکردنی ژیانێکی تەندروست بۆ نەوەکانی داهاتوو، شایانی سەرنجە ئەو ژینگەیەی منداڵ تێیدا گەشە دەکات بە تایبەتی پێنج شەش ساڵی یەکەمی زۆر کاریگەری هەیە لە دروستکردنی کەسایەتی داهاتووی جا گەر منداڵێك لە خانەیەکی هەڵوەشاوە پێگەیشت بە درێژایی ژیانی کاریگەریی دەمێنێ.

لەم توێژینەوەیە هەڵساین بە دیارکردنی فاکتەرە بنچینەییەکانی ئەم قەیرانە پاش لێکۆڵینەوەیەکی قوول لە ڕەگ و ریشەی بابەتەکە لە دادگاکانی باری کەسێتی، پاشانیش ئەو ڕێگایانەمان دیارکردووە کە پێویستە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی و ئارامکردنەوەی بارەکە. بێگومان لێرە قانون ڕۆڵێکی مەزن دەبینێ بۆیە ڕێکخستنەوەی بەندەکانی قانونمان ئەنجامداوە. بەم شێوەیە لێرەدا جێگەی ئەوە نەماوە باس لە دەرەنجامەکان و ڕاسپاردەکان بکەین.

بەلایەنی ئێمە کوردستان سەندرێلایە، ئاواتەخوازین ئەو چارەسەریانەی پێی گەیشتووین ئەو پاڵەوانەبێت کە سەندرێلا چاوەڕوانی بوو.



## پاشکۆ

(١٣٢)




١٣٢- ئەم ئامارە لە مێژووی (٢٠٠٧\١\١)-(٢٠٠٧\٦\٣٠) دەگرێتەوە، ژمارەکان وەرگیراون لە: گۆڤاری راوێژ ژمارە (٢٠) کانونی یەکەمی ٢٠٠٧، ل ٤٠.

٢٠ دادگای
ناوچەی هەولێر

## سەرچاوە و ژێدەرەکان

### ◀ پەرتووکەکان:

- **زمانی کوردی:**


١. ئالن پیز و باربارا پیز، بۆچی پیاوان درۆ دەکەن و ژنانیش دەگرین؟، وەرگێرانی لە فارسیەوە: جەبار تەنیا و هێمن شەریف، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٢. ئالن پیز و باربارا پیز، ژنان و پیاوان بەرامبەرن؟ نەخێر هەرگیز وا نیە، وەرگێڕانی: سالار عبدالرحمن صالح، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەهەند، ٢٠٠٦.
٣. ئەندرۆ متیۆس، دوایین رازەکانی ژیان، وەرگێڕانی: کارۆ شێخ، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و پەخشی رێنما، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٤. بورهان محمد امین، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، بلاوکراوەی کتێبخانەی رۆشنبیری، سلێمانی — هەولێر، ٢٠٠٤.
٥. دامەزراوەی میهەن، کۆمەلگای مەدەنی هێزێکی نوێ، وەرگێرانی: کۆسار فەتاحی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
٦. دیل کارنگی، چۆن سامان و سەرکەوتن و سەرکردایەتی بەدەست دێنی، وەرگێڕانی: دیار عەلی، چاپی دووەم، چاپەمەنی گەنج، کوردستان، ٢٠٠٧.
٧. دیل کارنگی، دوودڵی و زاڵبوون بەسەر نیگەرانی دا، وەرگێرانی: شەریف حەمە رەشید، چاپی دووەم، نێوەندی بلاوکراوەی ئارام، بەبێ ساڵی چاپ.
٨. دیل کارنگی و دوروتی کارنگی، یاساکانی هاوسەرداری، وەرگێرانی:جەبار تەنیا، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا،سلێمانی ، ٢٠٠٦.

٩. رزگار محمد قادر، چەند وانەیەك لە تاوانناسی، بەرگی یەكەم، چ١، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠.
١٠. پ.ی.د.رزگار محمد قادر، لە پێناو كوردستانێكی نوێدا، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.
١١. د.علی وردی، كارە نائاساییەكانی نەست یان نەهێنی كەسێتی سەركەوتوو، وەرگێڕانی: بەرزان ئەحمەد، چاپی دووەم، خانەی چاپ و بلاوكردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥.
١٢. لێن و. لێنكستەر، خواوەندانی هزری سیاسی، وەرگێڕانی: كامەران محمەد پور، چاپی یەكەم، چاپخانەی رۆژهەلاّت، هەولێر، ٢٠٠٧.
١٣. د.مەعن خەلیل، كۆمەلناسی خێزان، وەرگێرانی: ئارام ئەمین جەلال، چاپی یەكەم، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٧.
١٤. مۆنتسكیۆ، روحی یاساكان، وەرگێڕانی: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣ .

- **زمانی عەرەبی:**

١٥. القران الكريم.
١٦. د.احمد علي الخطيب و د.حمد عبيد الكبيسي و د.محمد عباس السامرائي، شرح قانون الاحوال الشخصية، ط ١، دار الكتب للطباعة و النشر، ١٩٨٠.
١٧. آر .الن هايز، دور مجموعات اصحاب المصالح، اوراق الديمقراطية، رقم (٩)، وزارة الخارجية الأميركية، مكتب برامج الأعلام الخارجي.
١٨. د.بهاءالدين خليل تركية، علم الأجتماع العائلي، ط١، الأهالي للطباعة و النشر و التوزيع، دمشق، ٢٠٠٤.
١٩. جاسم العبودي، التجريم و العقاب في اطار الواقع الاجتماعي، دار الحكمة الطباعة و النشر، اربيل، ١٩٩٠.



٢٠. د.حسن كيره، المدخل الى القانون، منشاة المعارف، بدون سنة طبع.
٢١. د. حسنين المحمدى البوادى، الخطر الجنائي و مواجهته، مطبعة عصام جابر، ٢٠٠٣.
٢٢. د.حسن علي الذنون، المبسوط في شرح القانون المدني ، الخطا (المبسوط في المسؤولية المدنية)، ط٢، ج ٢، دار وائل، عمان، ٢٠٠٦.
٢٣. سيغموند فرويد، معالم التحليل النفساني، ترجمة الى العربية: محمد عثمان نجاتي، ط ٤، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩٧.
٢٤. د.طاهر الجنابي، علم المالية العامة و التشريع المالي، توزيع المكتبة القانونية، بغداد، بدون سنة طبع.
٢٥. عبدالباقي البكري و زهير البشير، المدخل لدراسة القانون، بيت الحكمة، ١٩٨٩.
٢٦. د.عبدالله العظيم بدوي، الوجيز في فقة السنة و الكتاب العزيز، ط ٣، دار بن رجب، ٢٠٠١.
٢٧. د. عبدالمجيد الحكيم و عبدالباقي البكري و محمد طه البشير، الوجيز في نظرية الالتزام في القانون المدني العراقي، الجذء لاول في مصادر الالتزام، ١٩٨٠، ص ١٢٠- ١٢٤.
٢٨. د.علي القائمي، الأسرة و قضايا الزواج، ط٣، دار النبلاء، بيروت، ٢٠٠٤.
٢٩. عمرو خالد، الصبر و الذوق، ط٣، دار المعرفة للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت، ٢٠٠٤.
٣٠. محمد زيد الابياني، شرح الاحكام الشريعية في الاحوال الشخصية، الجزء الاول، منشورات مكتبة النهضة، بيروت- بغداد.
٣١. د.محمد عبدالمقصور عفيفي و محمد بن صالح العثيمين و محمد ناصرالدين الألباني و صالح بن فوزان الفوزان و شيخ الاسلام ابن تيمية و عبدالله بن عبدالرحمان الجبرين و عبدالعزيز بن عبدالله بن باز و محمد بن ابراهيم آل الشيخ

و عبدالرحمان بن ناصر السعدي و اللجنة الدائمة للافتاء، فتاوي المرأة المسلمة، دار ابن هيثم، قاهرة، ٢٠٠٢.

٣٢. د.مصطفى البغاء و د.مصطفى الخن و علي الشرجي، الفقه المنهجي على مذهب الامام الشافعي، ط ٦، المجلد الثاني، احكام الاسرة و ملحقاتها: الاحوال الشخصية: الوقف و الوصية و الفرائض، دار القلم و دار الشامية، ٢٠٠٥.

٣٣. البروفيسور د. مصطفى ابراهيم الزلمي، فلسفة القانون، مؤسسة O.P.L.C للطباعة و النشر، ٢٠٠٨.

٣٤. د.مصطفى الزلمي و عبدالباقي البكري، المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية، بيت الحكمة، بغداد، ١٩٨٩.

٣٥. د.مصطفى السباعى، شرح قانون الاحوال الشخصية، ج١، دار الوراق، ٢٠٠٠، بيروت.

٣٦. ملفين آي. يوروفيسكي، المبادئ الاساسية للديمقراطية، اوراق الديمقراطية، رقم (١)، وزارة الخارجية الأميركية، مكتب برامج الأعلام الخارجي.

• زمانی ئینگلیزی:

٣٧. Grada A.Kleijkamp، Family Life and Family Interests، Published by Klawer Law International، First Published 1999.



◀ **تویژینەوەکان:**

• **زمانی کوردی:**

**٣٨.** بێدار فارس عزیز، فەلسەفەی مافی مرۆڤی سەردەم، زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی قانون، ٢٠٠٧.

**٣٩.** پارێزەر: بکر حمەصدیق عارف، رەهەندە فقهی و کۆمەلایەتیەکانی قانونی باری کەسێتی و چەند سەرنجێك، گۆڤاری پارێزەر، ژ (٢٢) سالّی ٢٠٠٤.

**٤٠.** پارێزەر: چێنەر علی جۆلا، خوێندنەوەیەك بۆ قانونی کۆمەلەکانی ژ(١٨)ی سالّی (١٩٩٣)، گۆڤاری پارێزەر، ژمارە (١٨) ی سالی ١٩٩٣.

• **زمانی عەرەبی:**

**٤١.** د.احمد مصطفى سليمان ، نظام الاسرة في الاسلام ، مجلة پارێزەر ،العدد(١) سنة ٢٠٠١.

**٤٢.** د.خالد محمد صالح، استخدام العنف ضد المراة دراسة تحليلية مقارنة، مجلة تەرازوو، العدد (٣٢-٣٣) سنة (٢٠٠٧-٢٠٠٨).

**٤٣.** د. محمد شلال حبيب، تأملات في تربية الشباب و تحصينهم ضد الجريمة، مجلة القانون المقارن، العدد(١٩) سنة ١٩٨٧.

**٤٤.** هدى عصمت محمد أمين، الحضانة في قانون الأحوال الشخصية العراقي و الأتفاقيات الدولية، رسالة ماجستير قدمت الى جامعة صلاح الدين-اربيل، ٢٠٠٦.

• زمانی ئینگلیزی:

45. Judith Milliken and Treror Todd، Mental Capacity and marriage "Feature Report on Older Adults and the law،" Published in spring 2006، University of Alberta.
46. Sara E. Melendez، The Nonprofit Sector Cornerstone of Civil Society، Issues of Democracy، Electronic Journals of the U.S Information Agency، Vol3 No.1، January 1998.



**◀ گۆڤار و رۆژنامەی کوردی:**

**٤٧.** دایکی لاس، ئافرەت و کۆمەڵگا، گۆڤاری راوێژ ژ(٢٠) کانونی یەکەمی ٢٠٠٧.
**٤٨.** رووناك رەووف سەعید، گۆڤاری بزاو ژمارە (١٢) ئابی ٢٠٠٧.
**٤٩.** گۆڤاری گولاّن ژمارە (٥٥٧) ساڵی (٢٠٠٥)، لەپێناو خۆشەویستیدا.
**٥٠.** هێمن تاهیر، گوگل دژی ئەو حکومەتانە دەوەستێتەوە کە سانسۆر دەخەنە سەر ئینتەرنێت، وەرگێراو لە (DW)ی ئەلمانی، رۆژنامەی خەبات ژمارە (٢٨١٦) لە (٢٠٠٨/٤/١٢).
**٥١.** گۆڤاری گولاّن ژمارە (٦٧١) شوباتی ٢٠٠٨، پرسی ژن و دەستنیشانکردنی ئاسۆی چارەسەریی.

**◀ دەستورەکان:**

**٥٢.** دەستووری ئێراقی فیدرال (٢٠٠٥).

◀ قانون و بڕیارەکان:

**٥٣.** قانون الاحوال الشخصيه رقم (١٨٨) لسنه (١٩٥٩) المعدل.
**٥٤.** قانون رقم (١٥) لسنة (٢٠٠٨)، قانون تعديل تطبيق قانون الاحوال الشخصية رقم (١٨٨) لسنة (١٩٥٩) المعدل في اقليم كوردستان – عيراق.
**٥٥.** قانون رعايه القاصرين رقم (٧٨) لسنه (١٩٨٠) المعدل.
**٥٦.** قانون رقم (٢٠) لسنه (١٩٧٨).

ڕاسپاردەی تایبەت بە رەزامەندی و تەمەنی دونیا و تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەریی (١٩٦٥)، کە دەرچووە لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٦٢).

**◀ فەرهەنگەکان:**

د. نــوری تالــەبانی، فەرهــەنگی قــانونی، چــاپی دووەم، بڵاوکــراوەی بــیرو هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٦.

◀ ئەنتەرنێت:

57. Divorce، From Wikipedia the Free encyclopedia، available on: <http://en.wikipedia.org>.
58. Divorce Causes، available at: <http://www.paralumun.com> (last vested March 02، 2008).
59. Marina Ottaway، Don't confuse Woman's Right and Democracy، Publisher: Carnegie International Herald Tribane March- 30 -2004، P2، available on: <http://www.carenieendoment.org>
60. Maxwell Payne، The most Frequent Cause of Divorce، Published Jul 19/2007. available at: <http://www.associatedcontent.com> (last vested March 03، 2008).
61. World Divorce Statistics، available at<http://www.dirorcemag.com> (last vested March 02، 2008).

**٦٢.** أ. جاسـم المطـوع، تـدخل الأهـل فـی الحيـاة الزوجيـة، متـاح علـی الموقـع: .<http://www.almutawa.inf>





**٦٣.** د.حــسام الــدين عفانــة، الــزواج المبكــر، متــاح علــی الموقــع: <http://www.yasaloonak.net>.

**٦٤.** فاضـل عبـاس، تنظـيم سـن الـزواج لـيس مـؤمرة، متـاح علـی الموقـع: .<http://www.ahewar.org>

**◀ محاضرات:**

**٦٥.** د.محمد معروف ،محاضرات في قانون العقوبات العام (٢٠٠٧-٢٠٠٨)، القيـت علی طلبة كلية القـانون و الـسياسة-قـسم القـانون-المـسائی \جامعـة صـلاح الديـن.

**٦٦.** سمينــارێکی (پرۆفیــسۆر د. مــستەفا ئیــبراهیم زەلمــی)، فەلــسەفەی قــانون، (١\٣\٢٠٠٩) لە هۆلی مــەدرەجی کــۆلێجی قــانون و رامیــاری – زانکــۆی سەلاحەددین.